حکومەتی هەرێمی کوردستان - عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئەدەبی کوردی

## بۆ پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی


دانانی
لیژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە

داڕشتنەوەو بژارکردنی هەردوو بەشی ڕێزمان و ئەدەب

د. عەزیز گەردی | شێرکۆ ئەحمەد حەوێز | محەمەد ئەحمەد محەمەد
موحسین ئەحمەد کەریم | عەبدولستار فەتاح | عەلی عەبدوڵڵا ساڵح

کراوە



چاپی دەیەم ١٤٣٧ کۆچی ٢٠١٦ زایینی ٢٧١٦ کوردی

# پێشدەستی:

لێژنــەی بــژاردنو پێداچــوونەوەو دارشــتنەوەی هــەردوو بەشــی ڕێزمانو ئەدەبی ئەم پەڕتووکە گۆڕانکارییەکی زۆری لەناوەڕۆکی ئەم دوو بەشدا ئەنجام داو هەردوو بەشـەکەش بـە هێنانـەوەی نموونـە لـە هەردوو زارە سەرەکییەکەی زمانی کوردی، دەوڵەمەندکران، بۆیـە داوا لە مامۆستا بـەڕێزەکانی بابـەتی زمـانو ئـەدەبی کوردی دەکـەین کـە گرنگـی بـە هـەموو نموونــەکان بـدەنو قوتابیـانو خوێنــدکارانی لێ بەرپرس بکەن.

هـەروەها داواکـارین مامۆسـتایانی بـەڕێز پابەنـد بـن بـەو بەشـە نموونانەی کـە بـۆ لەبـەرکردن دەستنیـشان کـراون لـە هـەردوو بەشـی ئەدەبو نموونەی ئەدەب، بۆیەش وا کراوە تا خوێندکارانی پۆلی یازدەمی ئامادەیی لە سەرتاسەری قوتابخانـە بنەڕەتی و ئامادەییـەکانی هەرێمـدا پابەندبن بە پرۆگرامو بۆ هەموویان وەکو یەك بێت.

دوا جـاریش داوا لـە مامۆسـتایانی بـەڕێزو خۆشەویـستی زمـانو ئــەدەبیاتی کــوردی دەکــەین کــە بــەهۆی بەڕێوەبەرایــەتی گــشتی پــەروەردەی پارێزگەکانیانــەوە ئاگادارمـان بکەنــەوە لـە هـەر کـەمو کورتیو ناتەواویەك کـە لـەکاتی وانـە گوتنـەوەدا هەسـتی پێدەکـەن بـۆ ئــەوەی لــە چــاپەکانی داهــاتوودا چــاك بکرێنــەوە، دیــارە هــیچ بەرهـەمێکیش بـێ کـەمو کورتی نابێت، خـوای گـەورە پـشتو پـەنای هەمووان بێت.

**لێژنەی بژارکردنو پێداچوونەوەو دارشتنەوە**

# ﴿ بەشی ڕێزمان ﴾

## ( ناوەڕۆکی بابەتەکان )

(وانەی یەکەم)

# جۆرەکانی پاڕستە

**ئەم نموونانە بخوێنەوە:**

**(ئـ)**

**١. نازانرێت کە ئاسۆ لەبەرچی دواکەوت.**

**٢. من نەزانییە کو سەردار دیٚ ڕۆمانیٚ نڤیسیت.**

**٣. من نەبیستییە کو شێرۆ دەست درێژبیت.**

**٤. بە کرێکارەکانم گوت کە کاتی خۆتان بەفیڕۆ مەدەن.**

**(ب)**

**١. مە ئەو دیت کو دکەنی.**

**٢. ئەو چرایەی کە ڕووناك بوو، کوژایەوە.**

**٣. من شڤان دیت کو ژترسان دلەرزی.**

**٤. پیاوەکەم دیت کە دەشەلی**

**(پ)**

**١. وی دەرمان خوار بەلکی پیٚ چێببیت.**

**٢. ئاراس نەهاتە قوتابخانە چونکە نەخۆش بوو.**

**٣. کە زەنگەکە لێدرا،خوێندکارەکان چوونە ژوورەوە.**

**٤. فەرهاد دهەڤبرکیٚ دە پشکدار نەبوو، چونکی نەساخ بوو.**

## خستنە ڕوو:

ڕستەکانی هەرسیٚ بەشەکە، ڕستەی ئاوێتەن، چونکە لە "شارستە"و "پاڕستە" پێکهاتوون، وەکو پێشتریش زانیمان "شارستە" لە ڕستەی

ئاوێتـەدا ڕسـتەیەکی سـەربەخۆیەو وشـەی لێکدەریشی پـێش ناکـەوێت، بەڵام "پاڕسته" بە تەنیا واتا ناداتو سەر بـە شاڕسـتەیەو کـاری ناوێـك، یـان هاوەڵناوێـك، یـان هاوەڵکارێـك دەکـات، جاڕبـەر هنـدێ، سـێ جـۆر پاڕسته هەن:

١. لەڕستەی یەکـەمی بەشـی (ئـ)دا، ڕسـتەی "نازانرێـت" شاڕسـتەیە، هەروەها گوتراوی (کە ئاسۆ لەبەرچـی دواکـەوت) ڕسـتەیەو لـەکارو بکەر پێکهاتووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە واتایەکی تـەواوی نییـە، بـە پێچەوانەی ڕسـتەی (نازانرێـت)، هـەروەها سـەر بـە شاڕستەکەشـەو ئـەرکی جێگـری بکـەری کـاری (نازانرێـت)ی لەشارسـتەکەدا پـێ سپێراوە، لەبەر ئەوە پێی دەگوترێت "پاڕستەی ناویی" چونکە ئەو ئەرکەی کە دەیکات، ئەرکی ناوە.

لەڕستەی دووەمی بەشی (ئـ)دا، مـن نەزانییـە، شاڕسـتەیە، چـونکی ئەو ژیژکـارەکی پێکهاتییـەو پـەیڤێ لێکـدەری ژ پێـشڤە نەهاتیـەو ڕامانو مەبەستەکا سەربخۆ ددەت، هەروەسا گـوتراوا ( کـو سـەردار دێ ڕۆمانێ نڤیسیت) ژ (کارو بکەرو بـەرکار)ی پێکهاتییـەو ڕامانـەکا سەربخۆ ددەتو سەر ب شارستێ ڤەیە، ئەرکێ بەرکارێ ڕسـتا (مـن نەزانیە) دبینیـت، ژ بەرهەنـدێ دبیـژنێ "پاڕسـتەی نـاویی" چـونکو ئەرکێ ناوی دبینیت.

٢. لەڕسـتەی یەکـەمی بەشـی (ب)دا، ڕسـتەی "مـە ئـەو دیـت"، شاڕستەیە، چونکە واتایەکی سـەربەخۆی هەیـەو جێنـاوی لێکـدەری "کو"ی پێش نەکەوتووە، هەروەها گوتراوی "کو دکەنی" ڕسـتەیە،

بەڵام لەبەر ئەوەی لەڕووی واتاوە بەستراوە بە ڕستەی یەکەمەوە واتا بە شارستەکەوەو بە تەنیا واتای نییەو چونکە وەسفی جێناوی ئەو دەکات لە شارستەکەدا، بۆیێ پێی دەگوترێت "پارستەی هاوەڵناویی".

هەر بەو جۆرەش لەڕستەی دووەمی بەشی (ب)دا، ڕستەی "ئەو چرایە کوژایەوە، شارستەیەو واتایەکی تەواوی هەیەو وشەی لێکدەریشی لە پێش دا نییە. گوتراوی " کە ڕووناک بوو" ئەویش ڕستەیە، بەڵام واتای تەواوی نییەو چونکە وەسفی چرایەکە دەکاتو جێناوی لێکدەریشی لەپێشە، بۆیێ پێی دەگوترێ "پارستەی هاوەڵناویی".

٣. لەڕستەی یەکەمی بەشی (پ)دا، ڕستەی "وی دەرمان خوار" شارستەیە چونکی ئەوژی واتایەکی سەربخۆ هەیە، پەیڤا لێکدەر ل پێش دا نینە. هەروەسا گۆتنا "بەلکی پێ چێبیت" ڕستەیە، بەلێ چونکو واتەیەکا سەربخۆ نینەو پەیڤەکا لێکدەریا لپێشو ئەم دشێین بێژین وەسفا کارێ شارستێ دکەت، ژ بەرهندێ دبێژنێ " پارستەی هاوەڵکاریی" چونکی ئەرکێ هاوەڵکاری دبینیت.

هەر بەو جۆرەیش لەڕستەی دووەمی ئەو بەشەدا، ڕستەی "ئاراس نەهاتە قوتابخانە" شارستەیە، واتای تەواوی هەیە، وشەی لێکدەری لەپێش نییە، "چونکە نەخۆش بوو" پارستەیە، چونکە بەتەنیا واتای نییە، پەیڤی لێکدەری لەپێشەو وەسفی کاری

شارستەکە دەکات، واتە هۆکاری نەهاتنەکە نیشان دەدات بۆیێ بەم ڕستەیە دەگوترێت "پارستەی هاوەڵکاری".

هەر بەو جۆرەی کە باسکرا، ڕستەکانی تری هەرسێ بەشەکەی پێشوو دەتوانین لێک بدەینەوە، دیارە ئەمەش کارێکی سروشتی مامۆستای بەڕێزی وانەکەیە.

## دەستوور:

**لەزمانی کوردیدا سێ جۆر پارستە هەیە:-**

**١. پارستەی ناوی : ئەو ڕستەیەیە کە سەر بە شارستەیەو واتاکەی بەندە بە واتای ئەوەوە، دەکرێ ببێتە جێگری بکەر یا تەواوکەری کاری شارستە وەکو لەڕستەکانی بەشی ( ئـ )دا دیارە یان هەر ئەرکێکی تری ناو ببینێ.**

**٢. پارستەی هاوەڵناوی : پارستەی هاوەڵناویی، لەڕستەی ناوێتەدا، ئەو ڕستەیەیە کو سەر بەشارستەیەو واتاکەی بە واتای ئەوەوە بەندەو وەسفی ناوێك دەکات لە شارستەکەدا، وەکو لەڕستەکانی بەشی ( ب )دا دیارە.**

**٣. پارستەی هاوەڵکاری : لەڕستەی ناوێتەدا ئەو ڕستەیەیە کەسەر بە شارستەیەو واتاکەی بەندە بە واتای ئەوەوە، وەسفی کارێك دەکات لە شارستەدا وەکو لەڕستەکانی بەشی ( پ ) دا دیارە.**

## ڕاهێنان ( ١ )

لەم ڕستانەدا پارستەکان دەربهێنەو جۆرەکانیان جیا بکەوە:

١. ئەم دخەبتین بەلکی ب ئارمانجا خۆ دگەهین.

٢. بیستوومە کە ئاشنا دەبێتە ئەندازیار.

٣. ئاشکرایە کو وەلات هەر ب زانستیٚ پێش دکەڤیت.

٤. ئەو وانەیەی کە خوێندمان زۆر گران بوو.

٥. کە بەهار هات دەچینە سەیران.

## ڕاهێنان ( ٢ )

١. سیٚ پارستەی ناویی لەڕستەدا بەکاربهێنە.

٢. سیٚ پارستەی هاوەڵناویی لەڕستەدا بەکاربهێنە.

٣. سیٚ پارستەی هاوەڵکاریی لەڕستەدا بەکاربهێنە.

## ڕاهێنان ( ٣ )

لەم ڕستەو دێرە هۆنراوانەدا پارستەکان دەربهێنەو جۆرەکانیان دەربخەو پاشان شلۆڤەیان بکە:

١. گریانی منو خەندەیی تۆ ئێستە دەشوبهێن.

بەو مەوسیمی بارانە کەوا غونچە دەپشکووت.

٢. نەم زانی کە پێشمەرگەکە لەبن دارەکە شەهید کرا.

٣. مە زانییە کو کۆمپیوتەر ل خوێندنگەهیٚ هەیە.

٤. نەم پرسی بوو کە باخەوانەکە هاتووە.

## ڕاهێنان (٤)

پارستەی ناویی " کو نارین دێ هۆزانێن خۆ بەلاڤ کەت"

لە ڕستەدا بەکاربهێنە، بە مەرجێك:

١. بکەر بێت ٢. جێگری بکەر بێت ٣. بەرکار بێت

## ڕاهێنان (٥)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕ بکەرەوە، بەمەرجێك یەکەمیان بە پارستەی ناویی، دووەمیان بە پارستەی هاوەڵناویی سێیەمیان بە پارستەی هاوەڵکاریی.

١. مامۆستاکەم پێی گوتم..............

٢. ئەو مرۆڤەی .............. شەرمەزارە.

٣. تێبکۆشن ............ .

# تەواوکەری کار

## ١. بەرکار

**ئەم ڕستانە بخوێنەوە:**

**( ئـ )**

**١. ئاوێرە چێشت لێ دەنێت.**

**٢. گەل ئێمەی هەڵبژاردووە.**

**٣. ناردمی بۆ بازاڕ.**

**٤. ڤانا چوار کتێبو شەش دەفتەری وەرگرتووە.**

**٥. مامۆستا ڕێزمانی کوردی فێری خوێندکاران دەکات.**

**(ب)**

**١. کوردێکم دەوێ چاپووکو پتـەو**
**سەفەرێك هەیە بۆم بکا بە شەو**

( هەژار )

**٢. تنێ فەرهاد دزانت لە زەتی عیشق**
**کو وی جان دایە شیرینێ نە پەروێز**

(جزیری)

**٣. من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش دەوێ**
**مۆژدەی شەفەقی لێ دەردەکـــەوێ**

(پیرەمێرد)

٤. بۆی عەنبەر نەتۆی دەماغم دوورکـەرد
فرسەتەش ئاوەرد هەوای وەبـای دەرد

(مەولەوی)

٥. پڕ بە دەم  بانگ ئەکەم سەربەستیم ئەوێ
کوردستانم جێی شێرانە ئەبێ ســەرکەوێ

(ع.ع. شەونم)

٦. بە خەنجەر گەر دەرئارەند دیدەگانم
بە ئاتەش گەر بسوزەند ئیســتخوانم
ئەگەر بەر ناخونانەم نەی بکو بەند
نەگیـرەم دڵ ز یـاری میـهرەبـانم

(بابە تاهیر)

٧. پڕ قووڵی هیــواو پــانی پەژارە
گۆڕێ هەڵکەنین بۆ ئەو سەردارە

(بلە)

٨. شۆخ و شەنگی زوهرە ڕەنگی دل ژمن بر دڵ ژمن
ئاورێن هەیـبەت پلنگێ دل ژمن بـر دڵ ژمـن

(جزیری)

٩. لەو هەرڕەفتم ئەز ژ مەیلێ        شوبهەتی سەهل و سوهەیلێ
موحبەت و عەشقاد مەیلێ        ئـەز کـرم یـەکسـەر پلۆخ

(جزیری)

## خستنه ڕوو:

لەسالآنی ڕابردوودا زانیمان کە یەکێك لەدوو بنچینەکانی ڕستە (بکەرو کار)ە، (کاریش) یان (تێپەڕە) یان (تێنەپەڕ)، ئاشکراشە کاری تێپەڕ پێویستی بە (بەرکار)هەیە. جا ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەبینین:

١. لەڕستەی یەکەمدا، پەیڤی (چێشت)ناوە و ئەرکی بەرکاری بینیوە، چونکە کاری تێپەڕی (لێ دەنێت)ی تەواوکردووەو ئەرکی کارەکەشی کەوتۆتە سەرو ئەگەر ببوایە وشەی (چێشت)مان لەو ڕستەیەدا نەهێنایە، نەمان دەزانی کە (ئاوێرە) چی لێناوە؟

٢. لە ڕستەی دووەمی بەشی (ئـ)دا، جێناوی (ئێمە) ئەرکی بەرکاری بینیوە، چونکە کاری تێپەڕی (هەڵبژاردووە)ی تەواوکردووەو ئەرکی کارەکەشی کەوتۆتە سەرو ئەگەر ببوایەو جێناوی (ئێمە)مان نەهێنایە، نەمان دەزانی کە (گەل) کێی (هەڵبژاردووە)؟ بەهەمان شێوەش لەڕستەی سێیەمی بەشی (ئـ)دا، جێناوی لکاوی (م) ئەرکی (بەرکاری) بینیوە، چونکە کاری تێپەڕی (نارد)ی تەواوکردووەو ئەرکی کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٣. لەڕستەی چوارەمدا هەردوو پەیڤی (کتێبو دەفتەر) ئەرکی بەرکاریان بینیوە، بۆکاری (وەرگرتووە)، هەر بەهەمان شێوەش لەڕستەی پێنجەمدا پەیڤەکانی (ڕێزمانی کوردی)و (خوێنکار) بەرکارن بۆ کاری (فێر دەکات)، ئەمەش ئەوە دەخاتە ڕوو کە دەشێ لەڕستەیەکدا زیاتر لە (بەرکارێك) هەبێت.

لەخوێندنـەوەی هۆنراوەکـانی سـەرەوەدا بۆمـان دەردەکـەوێت کـە پەیڤی (کوردێك، لەزەتی عیشق، جان، ڕەنگ، بۆی عەنبەر، سەربەستی، دیدەگان، ئیستخوان، ناخونان، دڵ، گۆڕێ، دڵ، ئەز ) هـەموویان ئـەرکی بەرکاریان بینیوە بەم شێوەی خوارەوە.

١. لەدێرە هۆنراوەی یەکەمدا پەیڤی (کوردێك) نـاوەو ئـەرکی بـەرکاری بینیـوە، چـونکە واتـای کـاری تێپـەڕی (دەوێ)ی تـەواو کـردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٢. لەدێڕە هـۆنراوەی دووەمـدا پـەیڤی (لـەزەتی عیـشق) نـاوەو ئـەرکی بـــەرکاری بینیـــوە، چـــونکە واتـــای کـــاری تێپـــەڕی (دزانیـــت)ی تەواوکردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سـەر هـەروەها پـەیڤی (جان) ناوەو ئەرکی بەرکاری بینیـوە، چـونکە واتـای کـاری تێپـەڕی (دایە)ی تەواوکردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٣. لە دێڕە هۆنراوەی سێیەمدا پەیڤی (ڕەنـگ) نـاوەو ئـەرکی بـەرکاری بینیوە، چونکە واتای کاری تێپەڕی (خۆش دەوێ)ی تـەواو کـردووە هەروەها کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٤. لـەدێڕە هـۆنراوەی چـوارەمدا پـەیڤی (بـۆی عەنبـەر) نـاوەو ئـەرکی بـەرکاری بینیـوە، چـونکە واتـای کـاری تێپـەڕی (دوور کـەرد)ی تەواوکردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٥. لـەدێڕە هـۆنراوەی پێنجەمـدا پـەیڤی (سەربەسـتی) نـاوەو ئـەرکی بـــەرکاری بینیـــوە، چـــونکە واتـــای کـــاری تێپـــەڕی (دەوێ)ی تەواوکردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٦. لـەدێڕە هـۆنراوەی شەشـەمدا پـەیڤی (دیـدەگان) نـاوەو ئـەرکی بـەرکاری بینیـوە، چـونکە واتـای کـاری تێپـەڕی (دەر ئارەنـد)ی تەواوکردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر. هەروەها پـەیڤی (ئیـستخوان) نـاوەو ئـەرکی بـەرکاری بینیـوە، چـونکە واتـای کـاری تێپەڕی (بسوزەند)ی تەواو کردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتـە سەر. هـەروەها پـەیڤی (ناخونـان) نـاوەو ئـەرکی بـەرکاری بینیـوە، چونکە واتای کـاری تێپـەڕی (بکوبەنـد)ی تـەواوکردووەو کاریگـەری کارەکەشی کەوتۆتـە سـەر. هـەر وەسـا پـەیڤی (دڵ) نـاوەو ئـەرکی بەرکاری بینیوە، چـونکە واتـای کـاری تێپـەڕی (نـەگیرەم)ی تـەواو کردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٧. لەدێڕە هـۆنراوەی حەفتەمـدا پـەیڤی (گـۆڕ) نـاوەو ئـەرکی بـەرکاری بینیوە، چـونکە واتـای کـاری تێپـەڕی (هەڵکـەنین)ی تـەواوکردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٨. لـەدێڕە هـۆنراوەی هەشـتەمدا پـەیڤی (دڵ) نـاوەو ئـەرکی بـەرکاری بینیـوە، چـونکە واتـای کـاری تێپـەڕی (بـر، بـرد)ی تـەواوکردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٩. لەدێڕە هۆنراوەی نۆیەمدا پەیڤی (ئەز) جێناوی کەسـی سـەربەخۆیە (جودا) ئەرکی بەرکاری بینیوە، چـونکە واتـای کـاری تێپـەڕی (کـر، کرد)ی تـەواوکردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

**دەستوور:**

**بەرکار ئەو ناوەیە یان ئەو جێناوەیە کە لەڕستەدا یان لەدێڕە هۆنراوەدا واتای کاری تێپەڕی تەواو کردووە یان تەواوی دەکات، کاریگەری کارەکەشی دەکەوێتە سەر.**

## ڕاهێنان (١)

لەم دێرە هۆنراوانەدا بەرکارەکان دیاری بکە:

١. کوێخایەك نانی بۆ ڕەنجبەرێ برد
زۆر زۆر بەسووکی تەماشای ئەکرد.

(قانع)

٢. ڕۆژی جەژنە چاوەکانت جوانە جەژنانەم ئەوێ
من بەهەڵپەم چاوەکانم، جامێ پێوانەم ئەوێ

(حسیب قەرەداغی)

٣. دەمگرێ ئەمما لەگرتووخانە ڕق ئەستوورترم
لێم دەدا ئەمما لەسەر داوا ڕەواکەم سوورترم

(هێمن)

٤. یەکێ نەمام ئەڕوێنێو یەکێ نەمام ئەنێژێ
ئەمیان چاوەڕێی گوڵەو ئەویان فرمێسك ئەڕێژێ

(ئەخۆل)

٥. شەرتە وەك فەرهاد قوڵنگی یادی شیرین هەڵگرم
تا لە پای کێوی فیراقا جێ دەهێڵم یادگار

(ئەخۆل)

## ڕاهێنان (٢)

لەڕستەی (**داهێن ڕێزمانی کوردی فێرکردین**)

ئـ- کاری ڕستەکە دیار بخەو چ جۆرە کارێکە؟

ب- وشەی (ڕێزمانی کوردی) شی بکەوە؟

پ - (ین) چییەو ئەرکی چییە؟

ت- (ی) لە وشەی ڕێزمانی کوردی شی بکەوە؟

ج- ئەم ڕستەی سەرەوە بە زاراوەی کرمانجی ژووروو بنووسەوە؟

## ڕاهێنان (٣)

ئەم دێڕە هۆنراوەیە شی بکەوە:

بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە
لە باخچەی بەهار گوڵم چنیوە.

## ڕاهێنان (٤)

وشەی (ڕۆژنامە) لەسێ ڕستەدا وەکو (بەرکار) بەکاربهێنە، بە مەرجێك لەڕستەی یەکەمدا لەگەڵ کاری ڕابردوو لەڕستەی دووەمدا لەگەڵ کاری ڕانەبردوو لەڕستەی سێیەمدا لەگەڵ کاری داخوازی بێت.

( وانەی سێیەم )

# تەواوکەری کار

## ٢. تەواوکەری بەیاریدە

( ئـ )

١. لاوەکان بەگیانی برایەتییەوە پەروەردە بکەن.

٢. نەوزادی نامەك ژ بۆ ئازادی نڤیسی بوو.

٣. مامۆستا وانە بۆ ئێمە ڕوون دەکاتەوە.

٤. حوکومەتا کوردستانێ خوێندنگەهـ ل گوندان دا ئاڤا کرییە.

٥. پێشمەرگەکان لەشکری دوژمن لە ناوچەکەدا دەردەکەن.

٦. ڕەزڤان گولان ل باغچێ دچینیت.

(ب)

١. ئێمە لە کارەکەدا سەردەکەوین

٢. سالار ل ژوورێ نڤست بوو.

٣. ئەم دچینە دهۆکێ.

٤. ئەڤـ کتێبانە ژ بۆ قوتابییان هاتینە.

٥. هەواڵەکان بە ئێوە گەیشتن.

## خستنه ڕوو:

ئـ- کاتێ سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەکەین، دەبینین:

١. لەڕستەی یەکەمدا گرێی (گیانی برایەتی) تەواوکەری بە یاریدەی بینیوە، چونکە واتای کاری تێپەڕی (پەروەردە بکەن)ی تەواو کردووە بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی(بە).

٢. لەڕستەی دووەمدا وشەی (ئازاد) ناوێکی تایبەتییەو ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی بینیوە، چونکە واتای کاری تێپەڕی (نڤیسی بوو)ی تەواوکردووە بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی (ژ بۆ ).

٣. لەڕستەی سێیەمدا وشەی (ئێمە) جێناوی کەسیی سەربەخۆیەو ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی بینیوە، چونکە واتای کاری تێپەڕی (ڕوون دەکاتەوە)ی تەواوکردووە بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی (بۆ).

٤. لەڕستەی چوارەمدا پەیڤی (گوندان) ناوێکی کۆی نەناسراوەو ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی بینیوە، چونکە واتای کاری تێپەڕی (ئاڤا کرییە)ی تەواو کردووە بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی (ل).

٥. لەڕستەی پێنجەمدا پەیڤی (ناوچەکە) ناوێکی تاکی ناسراوەو ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی بینیوە، چونکە واتای کاری تێپەڕی (دەردەکەن)ی تەواوکردووە بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی (لە- دا).

٦. لەرستەی شەشـەمدا پـەیڤی (باغـچیٚ) نـاوێکی تـاکی نەناسـراوەو ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی بینیوە، چـونکە واتـای کـاری تێپـەڕی (دچینیت)ی تەواو کردووە بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی (ل).

ب– ئەگەر سەرنج بدەینە رستەکانی بەشی (ب) دەبینین:

١. لەرستەی یەکەمدا پەیڤی (کارەکە) نـاوێکی تـاکی ناسـراوەو ئـەرکی تەواوکـەری بەیاریـدەی بینیـوە، چـونکە واتـای کـاری تێنەپـەڕی (سـەردەکەوین)ی تـەواوکردووە بـە یاریـدەی ئـامرازی پەیوەنـدی (لە– دا).

٢. لەرستەی دووەمدا پـەیڤی (ژوور) نـاوێکی تـاکی نەناسـراوەو ئـەرکی تەواوکـەری بەیاریـدەی بینیـوە، چـونکە واتـای کـاری تێنەپـەڕی (نڤست بوو)ی تەواوکردووە بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی (ل– یٚ).

٣. لەرسـتەی سـێیەمدا پـەیڤی (دهـۆك) نـاوێکی تایبەتییـەو ئـەرکی تەواوکـەری بەیاریـدەی بینیـوە، چـونکە واتـای کـاری تێنەپـەڕی (دچین)ی تەواوکردووە بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی (ە، یٚ ).

٤. لەرستەی چـوارەمدا پـەیڤی (قوتابییـان) نـاوێکی کۆی نەناسـراوەو ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی بینیوە، چونکە واتای کاری تێنەپەڕی (هاتینە)ی تەواوکردووە بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی (ژ، بۆ ).

٥. لەرسـتەی پێنجەمـدا پـەیڤی (ئێـوە) جێنـاوی کەسـی سـەربەخۆیەو ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی بینیوە، چونکە واتای کاری تێنەپەڕی (گەیشت)ی تەواوکردووە بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی (بە).

## دەستوور:

**تەواوکەری بەیاریدە: ئەو ناوەیە یان ئەو جێناوەیە کە لەڕستەدا واتای کار تەواو دەکات بەیارمەتی ئامرازی پەیوەندی { بە- ەوە، لە- دا، بۆ، بەرەو، ژبۆ، ژ، ل، د، تا، ە } تەواوکەری بەیاریدە لەگەڵ کاری تێپەڕو تێنە پەڕدا دێتە کایەوە.**

## ڕاهێنان (١)

لەم دێرە هۆنراوانەی خوارەوەدا هەر چ بەرکارو تەواوکەری بەیاریدە هەن دەریان بهێنە:

٦. خوون ژ دل جۆجۆ ڕەوان تێ وەك عەقیقو ئەرخەوان تێ
لێ ژ دەست سەلوا جوان تێ ئەو شەپالا شەنگو شۆخ

(جزیری)

٧. با بە قولنگی تیژی فەرهادیی
هەڵکوتینە سەر بێستوونی شادیی

(بلە)

٨. ئەو چەم بە سورمەی خەمناکی ڕەشتە
چەنی گەشت دەشت پای ڕەشت سەرگەشتە

(مەولەوی)

٩. بۆت نووسیوم بۆت بنووسم ئەمن چیم
دوندی قەندیل گۆڕەپانی هەلگورد نیم
بـەرەو بـەرزی دەچـم گـەرچـی وردم
خـاکی بەرپێی تێکۆشـەرێـکی کـوردم

(هێمن)

١٠. لەهەموو ئاسمانا ئەستێرەی بەربەیان
ئەخاتە دڵی من هەستێکی سپیو جوان

(گۆران)

١١. ئەو کەسەی گیانی لەڕێگای نیشتمانا بەخت ئەکا
پێی مەڵێن مردووە شەهیدە وا لە فیردەوسی بەرین

(بێکەس)

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەم ناوانـەی خـوارەوە لەڕسـتەدا بەکاربهێنـە، جارێـك ببنـە بـەرکارو جارێك ببنە تەواوکەری بەیاریدە:

( وڵات – ڕۆژنامە – پێشمەرگە – زانست – گوڵ – پەرلەمان )

## ڕاهێنان ( ٣ )

جیـاوازی لـەنێوان بـەرکارو تەواوکـەری بەیاریـدە چـییە؟ بـە نموونـە ڕوونی بکەرەوە:

## ڕاهێنان (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەرەوە:

ئ- ئەو کتێبان ژ بۆمە دکڕیت.

ب- گۆڤارەکانیان بۆمان هێناوە.

پ- مامۆستا لەهۆڵی قوتابخانەدا دیارییەکەی پێشکەش کردین.

ت- ئەم ڕۆژنامەیەم خوێندۆتەوە بۆتان.

# جێناوی خۆیی

/١

ئـ- ئەو خۆی لە ئاوێنەدا دیت. (بەرکار)

ب- وێ خۆ ل ئاوینێ دا دیت.

/٢

ئـ- هەمیشە خۆم دەچم بۆ کتێبخانە. (بکەر)

ب- ئەز بخۆ دهێم بۆ دەڤ هەوە.

/٣

ئـــ- ئـــەوە خـــۆت بوویـــت کـــە لەتاقیکردنـــەوەدا دەرنەچـــوویت.
(تەواوکەری کاری بێ هێز).

ب- ئەڤە تۆ ب خۆ بووی کو ژ تاقیکردنێ دا دەرنەکەفتی.

/٤

ئـ- نازدار کچەکەی خۆی نارد بۆ زانکۆی دهۆك. (دیارخەری ناو)

ب- نازداری کچا خۆ هناردە زانکۆیا دهۆکێ.

/٥

ئـ- تۆ لە خۆتەوە هیچ کارێك مەکە. (تەواوکەری بەیاریدە)

ب- تۆ ژ خۆڤە هیچ کاران نەکە.

٦/

ئـ- خۆی نەزان و نەشارەزایە. (نیهاد)

ب- ئەو ب خۆ نەزان و نە شەهرازایە.

٧/

ئـ- خۆیان گیران. (جێگری بکەر)

ب- ئەو ب خۆ هاتن گرتنێ.

**خستنە ڕوو:**

لـەم ڕسـتانەی سـەرەوەدا پـەیڤی (خـۆ) وەکـو جێنـاوی خـۆیی بەکارهاتووەو لەهەریەك لەو ڕستانەدا ئەرکی تایبەتی خۆی هەیە:

١. لەڕستەی یەکەمدا پەیڤی (خۆی) لە وشەی (خۆ)و جێناوی کەسـیی لکاوی (ی) پێکهاتووەو لەگەڵ جێنـاوی کەسـیی سـەربەخۆی (ئـەو) بەکارهاتووە بۆ ئەوەی زیاتر جەخت لەسەر ئەو کەسە بکات، هـەر بـۆ زیـاتر چەسـپاندنی ئـەو کەسـەش، کـە کەسـی سـێیەمی تاکـە، جێنـاوی کەسـیی لکـاوی (ی) خراوەتـە سـەری‌و بـووە بـە (خـۆی)، ئەگەر زیاتریش لە ڕستەکە وردبینەوە بۆمە دیار دەبێـت کـو پـەیڤی (خـۆی) ئـەرکی (بـەرکار) لەڕسـتەکەدا دەبینێـت کـە یەکێکـە لـە ئەرکەکانی (ناو) لەڕستەدا. بەهەمان شێوەش لەڕستەی (وێ خـۆ ل

ئاوێنیٚ دا دیت )، پەیڤی خۆ هەر ئەو ئەرکەی پێشوو دەبینێت، بێ ئەوەی هیچ جێناوێکی کەسیی لکاوی خرابێتە سەر:

٢. لەڕستەی دووەمیشدا پەیڤی (خۆم) لە وشەی (خۆ)و جێناوی کەسیی لکاوی (م)ی کەسی یەکەمی تاك دروست بووە، بەکارهێنانیشی لەم ڕستەیەدا هەر بە مەبەستی جەختکردنە لەسەر جێناوی کەسیی سەربەخۆی (من)، لەڕستەکەشدا ئەرکی (بکەر)ی ڕستەکەی لەئەستۆ گرتووە.

٣. هەر بەم جۆرەش لەڕستەی ژمارە (٢)ی (ب)دا، پەیڤی (خۆ)، دیسان هەر بۆ تەوکیدی جێناوی (ئەز)ە، ئەرکەکەشی لەڕستەدا وەکو ئەوەی پێش خۆی (بکەر)ی ڕستەکەیە.

٤. لەڕستەی سێیەمدا، پەیڤی (خۆت) لە (خۆ)و جێناوی کەسیی لکاوی (ت) دروست بووە، لەجیاتی ناوی ئەو کەسە بەکارهاتووە کە گوناهی دەرنەچوونی دەخرێتە ئەستۆ، ئەرکەکەشی لەم ڕستەیەدا تەواوکەری کاری بێ هێزە (کاری ناتەواو)، هەر بەو جۆرەش لە ڕستەی ژمارە (٣)ی (ب)دا پەیڤی (خۆ) تەواوکەری کاری بێ هێزە.

٥. لەڕستەی ژمارە (٤)ی (ئ)دا، دیسان ژی پەیڤی (خۆی) لە وشەی (خۆ)و جێناوی کەسیی لکاوی (ی) دروست بووە، بەکارهێنانیشی هەر بۆ مەبەستی جەختکردنە لەسەر ناوەکە، ئەگەر بۆ ئەم مەبەستە نەبوایە دەمانتوانی بڵێین (نازدار کچەکەی نارد بۆ زانکۆی دهۆك)، کە لێرەدا لە وانەیە ئەو کچە، کچی نازدار خۆی نەبێت، بەڵام ئەو ناردبێتی بۆ زانکۆی دهۆك، کەچی کە ڕستەکە بەم

شێوەیە دەردەبڕێن: (نازدار کچەکەی خۆی نارد بۆ زانکۆی دهۆك) ئەو کاتە جەختمان لەسەر ئەوە کرد کە کچەکە هی نازدارەو پەیوەندی بە ئەوەوە هەیە. ئەرکی (خۆی) لەو ڕستەیەشدا دەبێتە دیارخەری ناوی کچەکە.

٦. هەر بەم جۆرەش لەڕستەی ژمارە (٤)ی (ب)دا، پەیڤی (خۆ) تەوکیدە بۆ ناوی کچەکەو بووە بە تەواوکەری، بەهۆی ئامرازی (ا)ی دانە پاڵەوە.

٧. ئینجا لەڕستەی ژمارە (٥)ی (ئـ)دا، پەیڤی (خۆت)، لە (خۆ)و جێناوی کەسیی لکاوی (ت) پێکهاتووە کە ئەویش بۆ تەوکیدو جێگیربوون خراوەتە سەری، ئەرکیشی تەواوکەری بەیاریدەی کاری (مەکە)یە.

٨. لەهەمان ڕستەی ژمارە (٥)ی (ب)دا، پەیڤی (خۆ) بەبێ جێناوی کەسیی لکاو بەکارهاتووەو لەو ڕستەیەدا ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی کاری (کاران نەکە)یە.

٩. لەڕستەی ژمارە (٦)دا، پەیڤی (خۆی) لە جێناوی (خۆ)و (ی)ی جێناوی لکاوی کەسیی پێکهاتووەو ئەرکەکەشی (نیهاد)ی ڕستەکەیە.

١٠. لەڕستەی ژمارە (٧)ی (ئـ)دا، پەیڤی (خۆیان) لە (خۆ)و جێناوی کەسیی (یان) پێکهاتووەو لێرەدا وەك (جێگری بکەر) بەکارهاتووە چونکە کاری ڕستەکە، کارێکی نادیارە.

## دەستوور:

١. جێناوی ( خۆ ) جێناوێکی هاوبەشە لەنێوان هەر شەش کەسیی تاک و کۆدا، ئەم جێناوەش واتای خۆیەتی و خاوەنییەتی دەگەیەنێت و کاتێک جێناوە کەسییە لکاوەکانی دەخرێتە سەر دەبێتە جێناوێکی لێکدراو وەك ( خۆم- خۆت- خۆی- خۆمان- خۆتان- خۆیان )

٢. لەزمانی کوردیدا ئەم جێناوە چەند شێوەیەکی هەیە وەك:

ئـ- خۆ: نموونە: بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم

بەنان و ئاوو جل و بەرگی خــــــۆم.

( بێکەس )

ب- خوە: نموونە: هەم ئەهلی نەزەر نەێن کو کورمانج

ئیشقی نەکرن ژ بۆ خوە ئارمانــــج ( خانی )

پ- زۆرجاریش لەشێوەی ( خود )دا بەکاردێت:

نموونە:

هەر کەسێ ئیظهاری دانایی بکات و مەقسەدی

خود پەسندی بێ، یەقین ئیظهاری نادانی دەکا

٣. جێناوی خۆیی لە دووباردا بەکارد :

ئـ- بۆ تەوکیدی ( ناو ) یان ( جێناو ) وەك:

ئەو خۆی نامەی نووسی.

کە لێرەدا جێناوی ( خۆ ) بۆ تەوکیدکردن و جەختکردنی جێناوی ( ئەو ) بەکارهاتووەو ئەگەر بۆ ئەم مەبەستە نەبوایە، دەمانتوانی بڵێین:

ئەو نامەی نووسی.

ب- کاتێك ئەگەر ( بکەر ) و ( بەرکاری ) ڕستەکە یەك بن ئەوا دەتوانین جێناوی ( خۆ ) بەکاربێنین وەك:

من خۆم خۆمم پێگەیاند

لـەم ڕستەیەدا ( بکـەر )و ( بـەرکار ) یـەك کەسـن و چـونکە ( خـۆ ) وەك ( بـەرکار ) بەکارهاتووە، بۆیە بوونی لەڕستەدا پێویستە، بەلابردنیشی ڕستەکە دەشێوێت.

٤. ئەگـەر جێنـاوی کەسیی سـەربەخۆ لەڕستەدا لەگـەڵ جێنـاوی ( خـۆ ) بـەکارهات و ( بکەر )ی ڕستەکە بوو وەك:

من خۆم نـانم خوارد.

ئەوا لەم بارەدا سێ جێناو لەڕستەیەکدا کۆ دەبنەوە، دووانی سەربەخۆ ( من، خۆ )و یەکێکی لکاویش ( م ). کۆبوونەوەی ئەم سـێ جێنـاوەش لەیـەك ڕسـتەدا پێویـست نییـە، بۆیە زۆر ڕەوایە هەردوو جێناوە سەربەخۆیەکان لاببەین و بڵێین:

نـانم خوارد.

ئینجا ئەگەر مەبەستمان تەوکید کردنـی جێنـاوە سـەربەخۆیەکە بێـت ئـەوا بۆمـان هەیە بڵێین ( من نـانم خوارد )، بۆ زیاتر تەوکیدیش لە پلەی سێیەمدا جێنـاوە خۆییەکـە دەخەینە ڕستەکەوەو دەیکەین بە:

من خۆم نـانم خوارد

٥. لەشـێوە زاری کرمـانجی ژووروودا جێنـاوی ( خـۆ- خـوە ) بـە تـەنیا دهێتـە بەکارهێنـان و جێناوی لکاوی ناخرێتە سەر، ئەم جێنـاوەش:

ئـ- ئەگەر ( بکەر ) یان ( نیهاد ) یان (جێگـری بکـەر) بـوو، ئـەوا پێـشگری ( ب )ی دەخرێتـە پێش وەك:

ئەز ب خۆ هـاتم = من خۆم هـاتم.

ئەو ب خۆ نەزانە = ئەو خۆی نەزانە.

ئەو بخۆ هـاتە گرتنێ = ئەو خۆی گیرا.

ب- بەڵام ئەگەر ( بەرکار ) بـوو ئـەوا ئـەم ( ب )ی پێـشگرە وەرنـاگرێـت و پێویـستی پێـی نـابێت وەك:

من خۆ شوشت = من خۆم شوشت.

تە خۆ هاڤێت = تۆ خۆت هاویشت.

وێ خۆ کوشت = ئەو خۆی کوشت.

٦. ( خۆ ) دەکرێ بە تەنیاو بەبێ هیچ زیادییەك بەكاربێت وەك:

خۆ بەخۆ دانیشتبووین = ئەم خۆ ب خۆ ڕوونیشتبووین.

دەشکرێ لەگەڵ جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەمو دووەمیش بەكاربێت وەك:

خۆم دەچم بۆ بازاڕ. ( م جێناوی لکاوی دەستەی یەکەمە )

ئەم پیاوانە خۆیین. ( ن جێناوی لکاوی دەستەی دووەمە )

هەروەها هەندێ جار دوو جێناوی دەستەی یەکەم لە دوویەك دێن و دەخرێنە سەر ( خۆ ) وەك:

خۆتم لێ مەکە بە بلیمەت ( ت.م )

یان جێناوێکی دەستەی یەکەمو یەکێکی دەستەی دووەم لەدوو یەك دەخرێنە سەر ( خۆ ) وەك:

ئەم کوڕانە برادەری خۆمن ( خۆمانن ). ( م، ن ) ( مان، ن ).

٧. جێناوی ( خۆ ) لە بەکارهێناندا تەواوی ئەرکەکانی ناو دەبینێتو دەبێتە: بکەر، بەرکار، نیهاد، تەواوکەری بەیاریدە، دیارخەری ناو، تەواوکەری کاری بێ هێز، جێگری بکەر.

٨. جێناوی ( خۆ ) لە ڕووی ڕەگەزو ژمارەو دۆخەوە بێ لایەنە، بۆنموونە:

ئازادی کوڕێ خۆ نەهینایە. ( نێر )

نازدارێ خۆ ئامادەکریە. ( مێ )

٩. هەر کاتێك ( خۆ ) بە پەیڤی ترەوە، ئالا، پەیڤی ناسادە ( داڕێژراو )و ( لێکدراو ) دروست دەکات وەك:

داڕێژراو: ( خۆیەتی، خۆیی، لە خۆوە، بەخۆ )

لێکدراو: ( خۆ پەسەند، خۆکوژ، خۆویست )

١٠. زۆرجار جێناوی لکاو دەخرێتە سەر ( خۆ )و پێوەی دەلکێت، جا پێوە لکانەکە لەبەشی پێشەوە یان دوواوە بێت، ئەوا مۆرفێمی ( ش، یش )ی پەیوەندی وەردەگرێت وەك:

خۆشم، خۆشت، خۆشی – خۆشمان، خۆشتان، خۆشیان

خۆمیش، خۆتیش، خۆشیی- خۆمانیش، خۆتانیش، خۆیانیش.

١١. جێناوی ( خۆ ) ئەگەر جێناوێکی دەستەی یەکەمی پێوەلکا ئەوا لەگەڵ کاری تێپەڕو تێنەپەڕیشدا دهێتە بەکارهێنان وەك:

خۆمان خانووەکەمان فرۆشت. ( تێپەڕ )

خۆیان بە پێ هاتنەوە. ( تێنە پەڕ )

بەڵام ئەگەر دوو جێناوی دەستەی یەکەمی پێوە بلکێت ئەوا تەنیا لەگەڵ کاری تێپەڕدا بەکاردێت وەك:

زەوییەکەی خۆمانمان فرۆشت.

پەرتووکەکەی خۆمت پێشکەش دەکەم

١٢. زۆرجار بۆ زیاتر تەوکیدو چەسپاندن ( خود ) دەخرێتە پێش ( خۆ )، بۆ نموونە دەکرێ بڵێین:

کارەکە بەخودی خۆت ئەنجام بدە.

کە لێرەدا ( خود ) تەنیا هەر بۆ تەوکید کردن هاتووەو لابردنی هیچ زیانێکی ئەوتۆ بە چەمکی ڕستەکە ناگەیەنێت.

## ڕاهێنان (١)

پەیڤی (خۆ) لەڕستەدا بەکاربێنە بە مەرجێك:

١. لەڕستەی یەکەمدا (بکەر)بێت.

٢. لەڕستەی دووەمدا تەواوکەری کاری بێ هێز بێت.

٣. لەڕستەی سێیەمیشدا نیهادی ڕستەکە بێت.

٤. لەڕستەی چوارەمدا دیارخەری ناوبێت.

٥. لەڕستەی پێنجەمدا جێگری بکەر بێت.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم ڕستانە لەتاکەوە بگۆڕە بۆ کۆ.

١. بە منداڵەکەی خۆمم خوێند.

٢. دوێنێ خۆت پارەکەت لێ سەندم.

٣. خۆی لێرە نییە خوای لێرەیە.

٤. من خۆم کارەکە جێبەجێدەکەم.

## ڕاهێنان (٣)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. جێناوی (خۆ) کەی پێشگری (ب)ی دەخرێتە پێش؟

٢. جێناوی (خۆیی) لە چەند باردا لەڕستەدا بەکاردێت؟ ئەو بارانە چین؟ بەنموونە ڕوونی بکەرەوە.

٣. کەی دەتوانین جێناوی خۆیی لەڕستەدا لاببەین؟ بە نموونە ڕوونی بکەرەوە.

٤. کەی جێناوی (خۆیی) لەگەڵ کاری تێپەڕو تێنەپەڕ بەکاردێت؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

٥. کەی جێناوی (خۆیی) مۆرفیمی (ش، یش)ی پەیوەندی وەردەگرێت؟ بەنموونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەم بۆشاییانە بە جێناوی خۆیی پڕ بکەوەو جێناوی لکاوی گونجاویشی بۆ دابنێ:

١. بۆ .......... لە وڵاتی .......... بە ئاسودەیی ژیان بەسەر دەبەین.

٢. بستێك لە خاکی .......... بە هەموو زێڕی دنیا ناگۆڕمەوە.

٣. پێڕێ .......... قسەی لەگەڵم دا کرد.

٤. لەگەڵ برای .......... چوون بۆ دەرەوە.

٥. لە .......... ەوە وەڵامی هیچ پرسیارێك مەدەوە.

## ڕاهێنان ( ٥ )

لەم ڕستانەدا پەیڤی (خۆ) شی بکەوەو ئەرکەکەشی دەربخە:

١. بە خۆتم گوت ئەم کارە مەکە.

٢. من خۆم چووم بۆ بازاڕ.

٣. ئەو ب خۆ هات گرتنێ.

( وانەی پێنجەم )

# جـێـناوی هەیی

( ئـ )

١. دیواری باخەکەی ئێوە ڕووخاوەو هی باخەکەی ئێمە نەڕووخاوە.

٢. کتێبی من مەخوێنەرەوە هی خۆت بخوێنەرەوە.

٣. بەو قەڵەمەی من مەنووسە بە هی خۆت بنووسە.

٤. ئەم کتێبەی من لەهی کێ چاکترە؟

( ب )

١. دیوارێ خانیێ هەوە هەڕفتییەو یێ خانیێ مە نەهەڕفتییە.

٢. کتێبا من نەخوێنە یا خۆ بخوێنە.

٣. ب دەستێن من ماری نەکوژە ب یێن خۆ بکوژە.

٤. ئەڤ کتێبا من ژیا کێ چاکترە؟

**خستنە ڕوو:**

لەمەو پێش زانیومانە کە جێناو لەجیاتی ناوێک لەڕستەدا بەکاردەهێت، ئینجا ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) بکەین دەبینین لە هەر ڕستەیەکدا جێناوێکی (هەیی) هەیە کە لەجیاتی ناوی شتێك بەکارهێنراوە کە تایبەتە بەشتێکەوە یان کەسێك خاوەندیەتی.

١. لەڕستەی یەکەمدا جێناوی (هی) لە بری ئەو شتە بەکارهێنراوە کە تایبەتە بە باخەکەوەو نەڕووخاوە (دیوار). لەم ڕستەیەدا ئەرکی (بکەر) ی بینیوە.

٢. لەڕستەی دووەمدا جێناوی (هی) لەبری ئەو شتە بەکارهێنراوە کە تۆ خودانی (خاوەندی) ئەویتو داوات لێ کراوە بیخوێنیتەوە (کتێب) لەم ڕستەیەدا ئەرکی (بەرکار)ی پێ سپێرراوە.

٣. لەڕستەی سێیەمدا جێناوی (هی)لە بری ئەو شتە بەکارهێنراوە کە من خودانی ئەوم (قەڵەم) داوام لێ کراوە پێی بنووسمو لەم ڕستەیەدا ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی کاری (بنووسە)ی پێ سپێرراوە.

٤. لەڕستەی چوارەمدا جێناوی (هی) لەبری ئەو شتە بەکارهێنراوە کە جێناوی پرسی (کێ) خاوەندێتیو بۆتە (دیارخراو). (تەواوکەری بەیاریدە)یە.

**تێبینی:** جێناوی (هی) ژمارەو ڕەگەز (جنس) پیشان نادات.

ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) بکەین دەبینین جێناوی (یا– یێ– یێن) هەیە کەلەجیاتی ناوی شتێك بەکارهێنراوە کە تایبەتە بە شتێکەوە یان کەسێك خاوەندەکەیەتی.

١. لەڕستەی یەکەمدا جێناوی (یێ) لەبری ئەو شتە بەکارهێنراوە کە تایبەتە بە (خانییەکەوە)و نەهەڕفتییە، (دیوار)، لەم ڕستەیەدا ئەرکی (بکەر)ی پێ سپێرراوە.

٢. لەڕستەی دووەمدا جێناوی (یا) لەبری ئەو شتە بەکارهێنراوە کە تۆ خاوەنـدی ئـەویتو داوات لێ کـراوە بیخوێنیتـەوە (کتێـب)و لـەم ڕستەیەدا ئەرکی (بەرکار)ی پێ سپێرراوە.

٣. لەڕستەی سێیەمدا جێناوی (یێن) لەبری ئەو شتانە بەکارهێنراوە کە من خودانی ئەوانمو داوام لێ کراوە پێیـان (بکـوژم) و لـەم ڕسـتەیەدا ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی کاری (بکوژە)ی پێ سپێرراوە.

٤. لەڕستەی چوارەمدا جێناوی (یا) لەبری ئەو شـتە بـەکارهێنراوە کـە جێناوی پرسی (کێ) خاوەندێتی، و لەم ڕستەیەدا بۆتە دیارخراو.

**تێبینـی:** لـە کرمـانجی ژووروودا شـێوەکانی تـاکی ئـەم جێنـاوە ڕەگـەز پیشان دەدەن، (یا) بۆمێ (یێ) بۆ نێر.

یێن: بۆ کۆی نێرو مێ، واتە ڕەگەز پیشان نادات.

## دەستوور:

**جێناوی هەیی ( هی- ئی- یا- یێ- یێن )[1] . ئەو جێناوەیە کە بۆ خاوەندێتی بەکاردەهێنرێت و خاوەنەکەی دەشێت ناو، یان جێناو بێت و لەڕستەدا ئەرکی ئەو ناوەی پێ دەسپێررێت کە جێی دەگرێتەوە.**

## ڕاهێنان ( ١ )

ئەم جێناوانە بۆ چ ناوێك دانراون بیان نووسە:

١ . نمرەی نەسرین لەهی من بەرزترە.

٢ . ئەسپەکەی تۆ، لەهی من خێراترە.

٣ . ئاهەنگەکەی ئێوە لەهی ئێمە خۆشتربوو.

٤ . پەڕتووکێن من ویێن تە زۆر بەسوودن .

٥ . مامۆستای ئێمە هاتووە هی ئێوە نەهاتووە.

---

(١) لە کرمانجی خوارووداا لەجیاتی جێناوی (هی) جێناوی (هێ) بەکاردەهێنن. پێڵاوەکە هێ من بوو.

لە کرمانجی ژووردا لەجیاتی جێناوی (یا) (ئا) بۆ تاکی مێ بەکاردەهێنن و لەجیاتی (یێ) (ئێ) بۆ تاکی نێر بەکاردەهێنن و لەجیاتی (یێن) (ئێن) بەکاردەهێنن.

ئەڤ کتێبە یا منە/ ئەڤ کتێبە ئا منە.

ئەڤ مامۆستایەیێ مەیە/ ئەڤ مامۆستایە ئێ مەیە.

– لە کرمانجی ژوورووداا لەجیاتی جێناوی هەیی (یێن) جێناوی (یێت– ئێت)– (بێد– ئێد– ئێن) بەکاردەهێنن، (یێن) ئێستا لە نووسیندا بەکاردەهێنن.

ئەڤ سێڤەیێن بەراورییانن/ ئەڤ سێڤە (ئێن– ئێت– یێد– یێت) بەراورییانن.

## ڕاهێنان ( ٢ )

لەجیاتی ئەو ناوانەی هێلیان بەژێردا هاتووە جێناوی هەیی دابنێ:

١. ئەڤە گوندێ مەنینە، گوندێ ئەوانە.

٢. ب پێنووسێ خۆ بنڤیسە.

٣. ئەسپەکەی تۆ لە ئەسپەکەی من خێراترە.

٤. ئاڤا کانییا ژ ئاڤا ڕووباری پاکژترە.

٥. بەقسەی دوژمن ناڕۆم بەڕێوە.

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەم ڕستانە شی بکەوە:

١. وتاری یەکەم هی فیسار بوو.

٢. باخچێ مە ژیێ وە جوانترە.

٣. شۆڕشی کوردستان هی گەلی کوردە.

## ڕاهێنان ( ٤ )

جێناوی (هی) لەسێ ڕستەدا بەکاربهێنە بە مەرجێك ببێتە:

١. بکەر.　　　٢. بەرکار　　　٣. تەواوکەری بەیاریدە.

( وانەی شەشەم )

# هاوەڵناوی بکەر

## هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو

١. مرۆڤی نووسەرو خوێنەر ڕووناکبیرن.

٢. کاڵای بیانی کڕیار بۆ خۆی دەکێشێت.

٣. دەردی کوشندە دەرمانی نییە.

٤. بدەستێن لەرزۆك و بچاڤێن گریۆك ژینا خۆ نەبوورینە.

٥. زانا دانایە و دانا توانایە

٦. نانەوای گەڕەکەکەمان مرۆڤێکی دەستپاکە.

٧. مرۆڤی نقستی هایی ژ خۆ نینە.

٨. قوتابی کەوتوو زیان لەخۆی و لە میللەتەکەی دەدات.

٩. پیاوی بخۆر لەش دروست و بەهێزە.

١٠. زەڵامێ بکوژ پێتڤیە بهێتە سزادان.

١١. خـوای پـەروەردگـار تاوانبـار دەبەخـشێت و پاداشـتی مرۆڤـی دادگەریش دەداتەوە.

١٢. هەڵگری بەرپرسییەتی باری سەرشانی قورسە.

## خستنه ڕوو:

ئەگەر بە وردی ڕستەکانی سەرەوە بخوێنینەوەو لێیان وردبینەوە، دێ بینین کە لەهەر ڕستەیەکدا، پەیڤێك یان زیاتر لە پەیڤێك هەیە کە واتای بکەریی دەبەخشێتو دەلالەت لە کار ئەنجامدەرەکە دەکات، بۆ نموونە:

١. لەڕستەی یەکەمدا هەردوو پەیڤێن (نووسەر)و (خوێنەر) کەسەك دەردەخەن کە کارێ نڤیسینو خواندنێ ئەنجام دابیتو ئەڤ کار ئەنجام دانەژی بوویتە سیفەتەکا هەمیشەییو بەردەوام بۆ وان. ئەمانە هەردووکیان لەڕەگی کارو پاشگر دروستکراون.

٢. لەڕستەی دووەمیشدا پەیڤی (کڕیار) لە ڕەگی کارو پاشگر دروستبووەو بەهەمان شێوەو ئاوای پێشوو سیفەتەکا هەمیشەییو بەردەوام ب وان کەسان دەبەخشێت کو کارێ کڕینێ ئەنجام دەدەن.

٣. ڕستەی سێیەم، پەیڤی (کوشندە) دەگرێتە خۆی کە ئەویش ئەم سیفەتە بە هەڵگرەکەی دەبەخشێتو لەڕووی دروستبوونیشەوە لەڕەگی کارو پاشگر دروستبووە.

٤. هەر بەهەمان شێوە، هەردوو پەیڤێن (لەرزۆك)و (گریۆك) لە ڕستەی چوارەمدا ئەو سیفەتە هەمیشەییە بە خاوەنەکانیان دەدەنو لەڕووی دروستبوونەوە هەریەك ژوان لەڕەگی کارو پاشگرێك دروست بووە، چاوگی یەکەمیان (لەرزین)و یێ دووەمیشیان (گریان)ە.

٥. پەیڤەکانی (زانا)و (دانا) و (توانا)ش کە هەرسێکیان هاوەڵناوی بکەری دارێژراونو دەلالەت لە سیفەتێکی بەردەوام دەکەن بۆ خاوەنەکانیان ئەوانیش هەر لەڕەگی کارو پاشگرێك دروستکراون.

٦. لەڕستەی شەشەم دا پەیڤی (نانەوا) دەلالەت لە کەسێك دەکات کە سیفەتێکی هەمیشەیی بە خۆوە هەڵگرتووەو لەناوی بەرجەستەی (نان)و پاشگرێك دروستبووەو بووە بە هاوەڵناوی بکەری دارێژراو.

٧. لەڕستەی حەفتەمدا پەیڤی (نڤستی) واتە (نوستوو) هەر ئەو مەبەستە دەبەخشێت کە پەیڤە دەستنیشانکراوەکان لەڕستەکانی پێشوودا دەیبەخشن، بەڵام لەڕووی دروستبوونەوە لە قەدی چاوگی (نڤستن)و پاشگری (ی) دروستبووەو دەلالەتیش لەو کەسە دەکات کە کاری نوستنەکەی ئەنجام دایە.

٨. لە ڕستەی هەشتەمدا دەبینین پاشگری (وو) دەخرێتە سەر قەدی چاوگی (کەوتن) بۆ ئەوەی بیکا بە (کەوتوو= کەوتی) کە هاوەڵناوێکی بکەری دارێژراوە.

٩. پەیڤی (بخۆر)ژی، هاوەڵناوی بکەری دارێژراوەو لە پێشگرو ڕەگی کارو پاشگر هاتیە دروستکردن، ئەو ژی سیفەتەکا هەمیشەیی بڤی کەسی ددەت.

١٠. (بکوژ) ژی ل ڕستا دەهێ، هاوەڵناوی (بکەری) دارێژراوەو لە پێشگرو ڕەگی کار هاتیە دروستکردن.

١١. لەڕستەی یازدەهەمدا سێ پەیڤ هەن کو دبنە (هاوەڵناوی بکەر)ی دارێژراو، ئەو سێ پەیڤە ژی بریتین لە: (پەروەردگار)و (تاوانبار)و

(دادگەر)، کو هەرسێك ب یەك دەستوور هاتینە دروستکردن ئەو ژی ناوی واتایی‌و پاشگرە.

١٢.وشـەی (هـەڵگر)یـش لەڕستـەی دوازدەمـدا لـە پێشگرو ڕەگـی کـار دروستبووەو بووە بە هاوەڵناوێکی بکەری داڕێژراو.

## دەستوور:

**هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو پەیڤێکە بە زۆری لە چاوگەوە دێتە دروستکردن بە هـۆی پێشگرو پاشگرەوە، هەندێکیشیان هەن کـە لـەناوو پاشگر دهێنـە دروستکردنێ، ئـەڤ پەیڤانە ژی دەلالەت ژ (کارکەر)ی دکەن‌و واتـای بکەریی ژی دەبەخشن.**

**دروستکردنی هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو:**

**وەکو لە پێشەوە گوتمـان سەرچـاوەی دروستکردنی ئـەڤ جـۆرە هاوەڵنـاوە چـاوگ‌و نـاوە، دروستکردنەکەش بەم جۆرە دەبێت:**

**١. ڕەگی کار لەگەڵ پاشگرێك: بەزۆریش ئەو پاشگرێن کو دگەل (ڕەگی کار)**

**بکار دێن ئەڤەنە:**

**ئـ- پاشگری (ەر) وەکو: نووسەر، خوێنەر.**

**ب- پاشگری (یار) وەکو: فرۆشیار، کڕیار.**

**پ- پاشگری (ندە) وەکو: بڕندە، کوشندە.**

**ت- پاشگری (ۆك) وەکو: گەڕۆك، مژۆك.**

**ج- پاشگری (ەك) وەکو: کوژەك، گیرەك.**

**چ- پاشگری (ا) وەکو: بینا، زانا**

٢. ناو لەگەڵ پاشگر، هەندێ لەو پاشگرانە تەنیا دەچنە سەر ناوی واتاییو دەیانکەن بە هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو کە هەندێ لەم پاشگرانە ئەمانەن:

ئـ- پاشگری (مەند) وەکو: هۆشمەند، بەهرەمەند...

ب- پاشگری (بار) وەکو: تاوانبار، ستەمبار...

پ- پاشگری (گەر) وەکو: دادگەر، ستەمگەر...

ت- پاشگری (گار) وەکو: پەروەردگار...

ج- پاشگری (وان، ڤان) وەکو: مەلەوان، هۆزانڤان...

چ- پاشگری (ناك) وەکو: خەمناك، ترسناك...

ح- پاشگری (وەر) وەکو: بەهرەوەر، هونەروەر...

هەندێکیشیان دەچنە سەر ناوی بەرجەستەو دەیانکەن بە هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو وەك.

ئـ- ەوا، ەوان، ڤان، وەکو: نانەوا، شاخەوان، دارڤان

ب- ندە وەکو: باڵندە.

پ- وەر وەکو: سەروەر.

٣. پێشگر لەگەڵ ڕەگی کار لەگەڵ پاشگر وەکو:

ب + خۆ + ەر = بخۆر ← نەخۆر

ب+ کە + ەر = بکەر ← نەکەر

٤. پێشگر لەگەڵ ڕەگی کار وەکو:

بمر، بسۆت، بنووس، بگۆڕ، نەگۆڕ، نەکوژ

٥. قەد لەگەڵ پاشگر وەکو:

ئـ - پاشگری ( وو، ی ) کە دەچێتە سەر قەدی چاوگی تێنە پەڕی ( تـائی و دالی )وەکو:

نوستن        نوست+ وو ( ی )= نوستوو ( نوستی ).

مردن        مرد + وو ( ی ) = مردوو ( مردی ).

بەڵام ئەگەر چاوگەکە ( یایی ) بوو ئەوا پاشگر دەبێتە ( و ) لەجیاتی ( وو ) وەکو:

فڕین        فڕی    فڕیو    ( فڕیی ).

بەزین        بەزی    بەزیو    ( بەزیی ).

ب- پاشگری ( ەوار، ەڤان ) دەچێتە سەر قـەدی چـاوگی تێپـەڕو دەیکـا بـە هاوەڵنـاوی بکەری داڕێژراو وەکو:

خوێندن    =خوێند + ەوار = خوێندەوار ( خوێندەڤان )

٦. ڕەگی کاری داڕێژراو وەك:

هەڵگر، هەڵبەز، هەڵفڕ

ئەمانە هەندێك بوون لەو پاشگرانەی کـە بـەکاردێن بـۆ دروسـتکردنی هاوەڵنـاوی بکەری داڕێژراو.

__هەندێك تێبینی:__

١. ئەو هاوەڵناوە بکەر داڕێژراوانەی کە بە پاشگری ( ندە ) کۆتـاییان دێت و لـە ڕەگـی کارەوە دروستدەبن بە زۆری بۆ کارو سیفەتێکی ناجێگیر بەکاردێن، بۆ نموونـە کـە دەڵێین:

( کوشندە ) مەبەستمان کەسێکە یان شتێکە کە کاری کوشـتنەکە ئەنجامـدەدات و بـە ئەنجامدانی کارەکە سیفەتەکەی لەسەر لادەچێت، ئـەم جـۆرە هاوەڵنـاوە بکەرانـە لـە کوردیدا بەکارهێنـانیان دەگمەن و کەمە.

٢. ئەو هاوەڵناوە بکەر داڕێژراوانەی کە لەڕەگی کارو پاشگری ( ا ) دهێنە دروستکردن جۆرە بەردەوامیی و جێگیری و موکومییەك لە کارو سیفەتێن وان دا هەیە، وەك ( زانا )، واتە کەسێك ئەو سیفەتەی بە بەردەوامی تێدا هەبێت.

٣. لە هاوەڵناوی بکەری دڕێژراوی وەك ( کڕیار ) پێدەچێت ئەو پاشگرەی کە خراوەتە سەر ڕەگی کارەکە پاشگری ( ار ) بێت بەڵام بۆ دەربڕینی سووکتر، بووە بە ( یار )، واتە ئەو ( ی )یە وەکو ناوبەندێك هاتووەو دەربڕینەکەی سووکتر کردووە.

٤. پاشگرێن ( کار، گەر ) کە دەخرێنە سەر ناوی واتاییو دەیکەنە هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو، جۆرە موبالەغەو زێدە ڕۆییێك لە سیفەتەکەیدا ڕوودەدات بۆ نموونە ( ستەمگەر ) کەسێکە کە زوڵم و ستەمێکی زۆری لێ چاوەڕوان دەکرێت.

٥. پاشگری ( گەر ) ئەگەر خرایە سەر ناوی بەرجەستە، نایکا بە هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو بەڵکو دەیکاتە ناوی پیشە وەکو: ئاسنگەر، دەرمانگەر، مسگەر، بەڵام پاشگری ( ەوا، ەوان، ڤان ) ناوی بەرجەستەش دەکەنە هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو ( ناوی بکەری داڕێژراو ) وەك: نانەوا، شاخەوان، دارڤان.

٦. پێشگری ( نە ) کە خرایە پێش ڕەگی کارەوە دەیکا بە هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو ( ناوی بکەری داڕێژراو ) بەڵام لە واتادا بە پێچەوانەی ئەو هاوەڵناوە بکەر داڕێژراوەیە کەبەهۆی پێشگری ( ب )و و ڕەگی کارەوە دروست دەبێت وەك:

نەمر × بمر

نەبین × ببین

نەسۆت × بسۆت

نەخۆر × بخۆر

نەگۆڕ × بگۆڕ

٧. پاشگری ( ناك ) دەخرێتە سەر ئەو ناوە واتاییانەی کەواتاییکی ناخۆش دەبەخشن و دەیانکەن بە هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو ( ناوی بکەری داڕێژراو )، هاوەڵناوەکانیش واتای ناخۆشیان لێ بەدی دەکرێت وەك: ترسناك، خەمناك.

**٨. زۆربەی ئەو چاوگە دارێژراوانەی کە بەهۆی پێشگری وەکو (هەڵ)و (دا)و (را) دروستدەبن هاوەڵناوی بکەری دارێژراویان بەهۆی ڕەگی کارەوە لێ دروست دەکرێت.**

**هەڵگرتن ← هەڵگر**

**هەڵبەزین ← هەڵبەز**

**داگرتن ← داگر**

**داماڵین ← داماڵ**

**ڕاماڵین ← ڕاماڵ**

## ڕاهێنان (١)

لەم دێرە هۆنراوانەدا هەر هاوەڵناوێکی بکەری دارێژراو هەبێت دەریان بهێنەو دەستووری دروستکردنەکەیان ڕوون بکەوە:

١. لەدەست ئەم چەرخە زانا زۆر کەسادن
هەمیشە دیلو مەستو نا مرادن

٢. ئەی فریشتەی چاو بەخومار
بەڵام بێکەسی هۆشیار
بێکەسی دنیای نووسین
دانەری بەستەی شیرین
مەبەستی منو تۆیە
بۆ ئەوە، ئەو ڕۆڕۆیە

(گۆران)

٣. مـــــــــەژێك ڤەكـــــــەن
لـــەورا ئـــەزێ پەرســـتڤانێ
بـەژنا تـەیا شـەنگو شـەپال
ســــــوندێ دخــــــۆم
چ ئــەڤرۆ بیــت، چ ســوباهی
ئــــــــەو دڤــــــــێتن
هەموو هیڤی یێد تە بێد فـرِی

٤. میوەی گەیشتووی زەردو سووری باخ
جریوەو جووكـەی دارســـتانی شـــاخ
٥. ملی كەچكرد وەنەوشە كەوتە بەرپێت وەك قەباحەتبار
كە دەركەوت خاڵی لێوت تێگەیی شێتو خـەتـابــارە.
٦. مزگەوتی كاتی چێشتەنگاوی چۆڵ
وەك مردوو كفنی بێدەنگی بەكۆڵ

## ڕاهێنان (٢)

لەم چـاوگانەی خـوارەوە هاوەڵنـاوی بكـەری دارِێـژراو دروسـت بكـەو چۆنیەتی دروستكردنەكەش پیشان بدە:
( سوتاندن– گۆرِین– نقستن– تێكردن– هەڵكەفتن )

## ڕاهێنان ( ٣ )

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. جیاوازی لەنێوان ئەو هاوەڵناوە بکەرە دارێژراوانەی کە بەهۆی پاشگری (ەر)و پاشگری (گەر) دروست دەکرێن چییە؟ لەڕووی دروست بوونو سیفەتەکانیانەوە.

٢. جیاوازی لەنێوان هەردوو پەیڤی (ستەمگەر)و (ئاسنگەر) چییە؟ لە ڕووی:

ئـ – شێوەی دروستکردن.

ب– مەبەستی بەکارهێنان.

## ڕاهێنان ( ٤ )

لە ڕستەی (**گەلی زاناو تێگەیشتوو بە ئامانج دەگات**):

١. وشەی زانا چییەو چۆن دروست کراوە؟

٢. وشەی تێگەیشتوو چییەو چۆن دروست کراوە؟

٣. وشەی زانا، تێگەیشتوو ئەرکیان چییە؟

٤. وشەیەکی تر بهێنە کە بەشێوەی وشەی زانا دروست کرابێت.

٥. وشەیەکی تر بهێنە کە بەشێوەی وشەی تێگەیشتوو دروست کرابێت.

## ڕاهێنانی ( ٥ )

لە چاوگی (بەزین، مردن) بە چەند ڕێگا هاوەڵناوی بکەری دارێژراو دروست دەکرێت؟ نیشانی بدەو لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە:

( وانەی حەوتەم )

# هاوەڵناوی بکەر

## هاوەڵناوی بکەری لێکدراو

ئەم نموونانە بخوێنەوە:

١. وان مەیخۆران ئەبتەر کریـن
بێ قووەتو ڕەنگ زەرکـرین
وەڵلا ژ دل کەرکەر کــرین
خانی بەسە ئاهـو ئەســەف

٢. دەڵێن دڵمان لەیەك پاکە، برای دینین لەیەك نەسلین
کەچی چاومان بەخێری یەکتری هەڵنایە، کەچ بینین

٣. لەڕێی ئەوبەری شاخ دەنگی زەنگ دێ
لـە شـوێنی راوکـەر تەقەی تفەنگ دێ

٤. گەلی دواکەوتوو بەشی جەخـارە
قوڕ بەسەر ئەوەی پەستو هەژارە

٥. کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە خۆ کردییـە
هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تالبی مەعنا دەکا

## خستنه ڕوو:

لەبابەتی هاوەڵناوی بکەری داڕێژراودا ئەوەمان دەرخست کە ئەو جۆرە هاوەڵناوە بە پلەی یەکەم لە چاوگەوە دەهێتە دروستکردن بە یارمەتی پاشگرو پێشگرەوە، هەروەها هەندێکیشیان لەڕووی دروستبوونەوە سەرچاوەکەیان ناوی واتاییو بەرجەستەیە لەگەڵ پاشگر.

لەم وانەیەشدا ئەگەر ئەو هۆنراوەو هۆزانانەی بە نموونە هێناومانن بخوێننەوە دەبینین:

١. لە نموونەی یەکەمدا خانی هۆزانڤان پەیڤی ( مەیخۆران)ی بەکارهێناوە کە لەناوی (مەی)و (ڕەگی کار) دروستبووەو سەرچاوەی پەیڤەکەش چاوگی لێکدراوی (مەیخواردنەوە)یە، بۆیە بەم پێیە پەیڤی (مەیخۆران)یش وەکو هاوەڵناوی بکەری لێکدراو بەکارهاتووەو ئەم هاوەڵناوە سیفەتێکی هەمیشەیی ب وان کەسان دەدەت کو کارو پێشێن وان ب بەردەوامی (مەی) ڤەخوارنە.

٢. لە نموونەی دووەمیشدا (پیرەمێرد)ی هۆزانڤان پەیڤی (کەچ بینین)ی بەکارهێناوەو ئەم پەیڤەش لە هاوەڵناوی سادەی (کەچ)و لەڕەگی کاری چاوگی (بینین)ەوە دروستبووەو پەیڤەکە وەسفی جێناوی (ئێمە) دەکات کە لە هۆنراوەکەدا لەشێوەی جێناوێکی لکاودا دەرکەوتووە لەگەڵ وشەی (چاو)دا، ئەم پەیڤەش وەکو هاوەڵناوی بکەری لێکدراو بەکارهاتووە چونکە سیفەتێکی بەردەوام بەو کەسانە دەدات کە کارو پیشەیان کەچ بینییە.

٣. لـه نموونـەی سـێیەمدا (گـۆران)ی هۆزانڤـان پـەیڤی (ڕاوکـەر)ی بـەکارهێناوەو ئـەم پەیڤـەش لـەناوی (ڕاو)و (ڕەگـی کـار)ی (کـە)و پاشـگری (ەر) دروسـتبووەو سەرچـاوەی دروستکردنەکەشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ چـاوگی لێکـدراوی (ڕاوکـردن)و سـیفەتێکی هەمیشەییش بە خاوەنەکەی دەدات کە ئەویش سیفەتی ڕاوکردنە.

٤. لـە نموونـە هـۆنراوەی چـوارەمدا هۆزانڤـان هـاتووە، هاوەڵنـاوێکی بکەری لێکدراوی لە چاوگی تێنەپەڕی (دواکـەوتن)ەوە وەرگرتـووە، ئەویش بە وەرگرتنی قـەدی چاوگەکەو ئینجـا زیـادکردنی پاشـگری (وو) بۆ سەر قەدەکە، دیارە چاوگە لێکدراوەکـەش لـە بنەڕەتـدا لـە هاوەڵکـاری (دوا)و چـاوگی سـادەی تێنەپـەڕی (کـەوتن)ەوە پێکهاتووە، بۆیە هاوەڵناوە بکەرە لێکدراوەکەش هـەر بـەو چەشـنە لە هاوەڵکاری (دوا)و قـەدی (کـەوت)و پاشـگری (دوو) دروسـتبووەو سـیفەتێکی هەمیـشەییو بـەردەوامیی داوە بـەو نـاوەی کـە لەپێشییەتی کە ئەویش ناوی (گەل)ە.

٥. لـە نموونـەی پێنجەمیـشدا پـەیڤی (خـۆکرد) دێتـە بەرچـاو کـە لـە جێناوی خۆیی (خۆ)و قـەدی (کـرد)ی چـاوگی تێپـەڕی (کـردن)ەوە دروستبووەو ئەم پەیڤەش لەم دێرە هۆنراوەیەدا وەکو هاوەڵنـاوێکی بکەری لێکدراو بەکارهاتووە.

## دەستوور:

هاوەڵناوی بکەری لێکدراو، پەیڤێکە سیفەتێک و توانایەکی تایبەتی بە هەڵگرەکەی دەبەخشێت و ئەم جۆرە هاوەڵناوە بکەرانەش لە کوردیدا بە چەند شێوەیەك دهێنە دروستکردن، گرنگترینیان ئەمانەن:

١. ناو لەگەڵ ڕەگی کار، یا هەر دەتوانین بلێین ئەڤ جۆرە ژ ( ڕەگی کار )ی ئەو چاوگە لێکدراوانە دروست دەبن کەبەشی یەکەمی چاوگەکانیان ناوە، وەکو:
پیاو کوژ، خوا پەرست، هەواڵگر، دەرمانفرۆش، وێنەگر، خوێنمژ کە لەچاوگە لێکدراوەکانی ( پیاو کوشتن، خوا پەرستن، هەواڵگرتن، دەرمانفرۆشتن، وێنەگرتن، خوێنمژین )ەوە دروستکراون.

٢. هاوەڵناو لەگەڵ ڕەگی کار: ئەمەش لەو چاوگانە دروست دەبێت کەبەشی یەکەمیان هاوەڵناوە وەك:
کەچ بین، تیژڕۆ، خۆشنووس، ڕەشپۆش، گەشبین.

٣. هاوەڵکار لەگەڵ ڕەگی کار لەگەڵ پاشگر وەك:
کەمخۆر، زۆرخۆر.

٤. هاوەڵکار لەگەڵ ڕەگی کار وەك:
پێشڕۆ، زۆروەڕ، کەم دوو ( دوێ ).

٥. ناو لەگەڵ ڕەگی کار لەگەڵ پاشگر یان پێشگر وەکو:
نانخۆر، خەباتکەر، ئیشکەر، نانبدە

٦. ناو یان جێناوی خۆیی لەگەڵ قەدی چاوگی تێپەڕ وەك:
دەستکرد، خۆکرد.

٧. جێناوی خۆیی لەگەڵ ڕەگی کار وەك:
خۆبین، خۆڕاگر، خۆ هەڵکێش، خۆناس.

٨. جێناوی خۆیی لەگەڵ ڕەگی کار لەگەڵ پاشگر وەك: خۆ خۆر

٩. ناو لەگەڵ قەدی چاوگی تێپەڕ لەگەڵ پاشگری (وو) یان (ی) یان (ە) وەك:

نان بردوو (نان بردی، نان بردە)

کار کردوو (کارکردی، کار کردە)

## تێبینی:

هاوەڵناوی بکەری لێکدراو وەکو ناو لەڕستەدا بەکاردێت و لەم بارەدا دەتوانین ناوی لێ بنێین (ناوی بکەر)، هەروەها تایبەتییەکانی ناویش وەردەگرێت وەکو:

١. دەکرێ کۆ بکرێتەوە وەك:

خواپەرستان لە پەرستگەکاندا دەژین.

٢. هەروەها وەکو ناو دەبێتە ناسراوو نەناسراو وەك:

دەرمانفرۆشەکە کۆمەڵێك دەرمانی تێکچووی فڕێ دا.

دەرمانفرۆشێك لەڕێگادا تووشم بوو.

٣. ئەرکەکانی ناویش دەبینێ، دەبێتە (بکەر، بەرکار، نیهاد، تەواوکەری بەیاریدە، دیارخەری ناو، جێگری بکەر، تەواوکەری کاری ناتەواو).

وەك:

| | |
|---|---|
| ١. وێنەگرەکە دوو وێنەی بۆ گرتین. | (بکەر) |
| ٢. من وێنەگر ل ئاهەنگا نەورۆزی دیت. | (بەرکار) |
| ٣. وێنەگرەکە شارەزایە | (نیهادە) |
| ٤. دێ ئەڤ وێنەی. ژوێنەگری کرم. | (تەواوکەری بەیاریدە) |
| ٥. وێنەی وێنەگرەکە زۆر کاڵ بوو. | (دیارخەری ناو) |
| ٦. ئەمە کامێرای وێنەگرەکەیە. | (تەواوکەری کاری ناتەواوە) |
| ٧. وێنەگرەکە بینرا. | (جێگری بکەر) |

## ڕاهێنان (١)

لەم دێرە هۆنراوانەدا هەر هاوەڵناوێکی بکەری لێکدراو هەیە دەریان بهێنەو دەستوری دروستکردنەکەیان نیشان بدە:

١. لەو ڕا کو دەما ژ غەیب فەك بوو
تەئریخ هەزارو شێستو ئێك بوو
ئیساڵە گەهشتە چلو جاران
وی پێشرەوی گونەهکاران

٢. فرمێسکی چاوم شەتاو ئەدا جۆش
وەنەوشە لەتاو دەردی من شین پۆش

٣. نێرگزا شەهلا شەپالی ئاسەمینا مێرغوزار
لەب خەمۆشی، مەی فرۆشی، دێم پەیاڵا، کێی توو

٤. ئەگەر گوناهێ وە نەم کەری بار
بەسەر، بەشمشێر، بە تەناف، بەداو
وەگەر نە حەیفەن بە واتەی بەدگۆ
نە پەردە مانۆ ڕازی منو تۆ

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. جیاوازی لەنێوان هاوەڵناوی بکەری دارێژراو ولێکدراو چییە لە ڕووی دروستبوونەوە.

٢. کەی هاوەڵناوی بکەری لێکدراو وەکو ناو لەڕستەدا بەکاردێتو ئەو ئەرکانەش چین کە پێی دەسپێررێت؟

## ڕاهێنان (٣)

لەم ڕستەو دێرە هۆنراوانەدا جۆری وشە هێڵوبەژێردا هاتووەکانو چۆنیەتی دروستبوونیانو ئەرکەکانیان پیشان بدە:

١. مرۆڤیێ کێم پرس زوو تشتی فێرنابت.

٢. چەرخی ستەمکار نەیبەخشی بەکەس.

دلێکی بیێ غەم، ژینێکی سەربەست.

٣. ئەوە موژگانی تۆیە یا وەکو تیرێکی دلدۆزە

ئەوە بالایی تۆیە یا بە قوربان سەرووی بوستانە

٤. مرۆڤی کۆستکەوتوو بیر لەماڵو سامانی دنیا ناکاتەوە.

٥. زاڵمەی لە خوا نەترسەی کافرەی بیێ مروەتە

قاتلەی عاشقکوژەی جەلادەکەی خونخوارەکەم

## ڕاهێنان ( ٤ )

هاوەڵناوی بکەری لێکدراو لەم دوو چاوگە دروست بکە، ئینجا هەر یەك لە هاوەڵناوەکان وەکو ناوی بکەر لە دوو ڕستەدا بەکاربێنە بە مەرجێك هەریەکەیان لەڕستەکانی یەکەمدا بووبێتە بەرکارو هەریەکەشیان لەڕستەکانی دووەمدا بووبێتە تەواوکەری بەیاریدە.

(نووسین، فرۆشتن)

## ڕاهێنان ( ٥ )

بەچەند ڕێگا دەتواندرێ هاوەڵناوی بکەری لێکدراو دروست بکرێت؟ بۆ هەر ڕێگایەك دوو نموونە بهێنەوەو لەڕستەدا بەکاریان بهێنە.

## ڕاهێنان ( ٦ )

لەم چاوگانە (کوشتن، مالین، کێشان، بردن ) هاوەڵناوی بکەری لێکدراو دروست بکەو چۆنیەتی دروست بوونی بنووسە.

( وانەی هەشتەم )

# هاوەڵناوی کراو

## هاوەڵناوی کراوی داڕێژراو

ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١. نامەیەکی نووسراوم بۆ ئازادی هەڤاڵم نارد.

من نامەکا نڤیسیی بۆ ئازادی هەڤاڵێ خۆ هنارد.

٢. زەوی کێڵراو بەزۆری گەنم و جۆی لێ دێتە چاندن.

زەڤیا کێلای ب زۆری گەنم و جە ژێ دهێتە چاندن.

٣. نانی سووتاو و ماستی ترشاو مەخۆ.

نانێ سۆتیی و ماستێ ترشیای مەخۆ.

٤. لە گەشت و گوزاردا بەزۆری خەڵک گۆشتی برژاو دەخۆن.

٥. ئەم سێوە فرۆشراوانە، سێوی ناوچەی بەرواریان بوون.

ڤان سێڤێن فرۆتی، سێڤێن دەڤەرا بەرواریـــان بوون.

٦. ئێمە کوشتەی دەستی نەخوێندەواری و هەژاریـــن.

ئەم کوشتەیا دەستێن نەخوێندەڤانیی و هەژارێنە.

## خستنه ڕوو:

لەوانەکانی پێشووداو لەباسی هاوەڵناوی بکەردا گوتمان ئەو جۆرە هاوەڵناوانە سیفەتێکی هەمیشەیی و بەردەوام بە خاوەنەکانیان دەبەخشن و دەلالەت لە کارکەرەکە دەکەن. لەم بابەتە تازەیەش دا ئەگەر بەوردی تەماشای ڕستێن سەرەوە بکەین دەبینین کە:

١. لەڕستەی یەکەمدا پەیڤی (نامە) کە ناوێکی گشتییە لەپاڵ هەردوو پەیڤێ (نووسراو، نڤیسی)دا بەکارهاتووە کە لەچاوگی (نووسین، نڤیسین)ەوە هاتینە وەرگرتن و پەیڤەکانیش بەم شێوە تازانەیان بووینە سیفەتێکی هەمیشەیی بۆ پەیڤی (نامە)کەو ئەوە دەردەخەن کە ناوی (نامە) کردەوەیەکی بەسەرداهاتووەو ئەم کردەوەیە، ئەو سیفەتە هەمیشەییەی پێبەخشیوە.

٢. لە هەردوو ڕستەی دووەمیشدا پەیڤەکانی (کێڵراو)و (کێلای) کە یەکەمیان لەگەڵ پەیڤی (زەوی)و دووەمیشیان لەگەڵ پەیڤی (زەڤیا= زەڤی) بەکارهاتوون ئەمانە هەریەکەیان لەڕووی دروستبوونەوە لەچاوگی (کێلان) هاتینە دروستکردن و هەریەکەشیان سیفەتێکی هەمیشەیی بەردەوام بە (زەوی- زەڤی)یەکە دەدەن، بەڵام دیارە لەڕووی دەستووری دروستکردنەوە ئەم دوو پەیڤە تۆزێك جیاوازی لەنێوان چۆنیەتی دروستکردنیان هەیە.

٣. لەڕســـــتەی سێیەمیـــشدا پـــەیڤی (ســــووتاو) کردەوەیــــەکی بەســەرداهاتووەو بـۆی بـووە بـە سـیفەتێکی هەمیـشەیی و وەسـفی پــەیڤی (نــان)ی پێکــردووە، ئەمــە لــە ڕووی واتــاوە، لــەڕووی دروستبوونیـشەوە تەماشـا دەکـەین وشـەکە دەچێتە سـەر چـاوگی (سووتان)، کە چاوگێکی سادەی تێنەپەڕی ئەلفییە.

٤. هــەروەها لەڕسـتەی چـوارەمدا بەهــەمان شـێوە وشــەی (بــرژاو) هاوەڵناوێکی کراوی داڕێژراوەو سـیفەتێکی هەمیـشەیی بـە خۆیـەوە گرتووەو لەڕووی دروستکردنیشەوە لە چاوگی (برژان) دروستکراوە، کە ئەویش چاوگێکی تێنەپەڕی سادەی ئەلفییە.

٥. لەڕستەی پێنجەمدا پەیڤی (فرۆشراو) هاوەڵنـاوی کـراوی داڕێـژراوەو لـــەڕووی دروســـتکردنەوەو لەچـــاوگی تێپــــەڕی (فرۆشـــتن)ەوە وەرگیراوە.

٦. لەڕستەی شەشەمدا پەیڤی (کوشـتە) هاوەڵنـاوی کـراوی داڕێـژراوەو لەڕووی دروستکردنەوە لەچاوگی تێپەڕی (کوشتن)ەوە وەرگــیراوە.

## دەستوور:

**هاوەڵنـاوی کـراوی داڕێـژراو پەیڤێکـە کـە کردەوەیـەکی بەسـەردا هـاتووەو ئـەم کردەوەیە بۆی بـووە بـە سیفەتێکی هەمیشەیی بـێ ئـەوەی بـزانین ئـەوەی کردەوەکـەی بەسەردا هێناوە کێیە یان چییە. هـەر لەبـەر ئـەم هۆیەشـە کـە ئـەم جـۆرە هاوەڵنـاوە داڕێــژراوە بــەزۆری لــەو چــاوگانە وەردەگیرێــن کــە تێپــەڕو نادیــارن، هاوەڵنــاوە**

داڕێژراوەکەش وەسفی ناوێك یان جێناوێك دەکات کە لە پێشییەوە هاتووە، هەر کاتێکیش ئەم جۆرە پەیڤانە بەتەنیا لەڕستەدا بەکاربێن و ناوو جێناویان لەگەڵدا نەیەت ئەوا دەبنە ناوو بە ( ناوی کراو ) دەناسرێن، بۆ نموونە :

١. نامە نووسراوەکەم بەدەست گەیشت. ( نووسراو هاوەڵناوی کراوی داڕێژراوە )

٢. نووسراوەکەم بەدەست گەیشت. ( نووسراو ناوی کراوە )

لەڕستەی یەکەمدا وشەی ( نووسراو ) هاوەڵناوی کراوەو وەسفی ناوی ( نامە )ی کردووەو تەواوکەرییەتی کەچی لەدووەمین ڕستەدا وشەکە دەبێتە ( ناوی کراو )و وەکو ناوێکی ئاسایی بەکارهاتووە، دیارە لەم بارەدا هەموو ئەرکەکانی ناویش دەبینێت و تایبەتییەکانیشی وەردەگرێت.

دروستکردنی هاوەڵناوی کراوی داڕێژراو :

١. ئەم هاوەڵناوە کراوە بەزۆری لە چاوگی سادەو داڕێژراوی تێپەڕ دروست دەکرێت ( ڕەگی کار ) وەردەگرین ئینجا پاشگری ( راو )یان ( رای ) دەخەینە سەر ڕەگەکە وەك :

| | | |
|---|---|---|
| نووسین | نووس | نووسراو ( نووسرای ) |
| هەڵواسین | هەڵواس | هەڵواسراو ( هەڵواسرای ) |

٢. لە شێوە زاری کوردی کرمانجی ژووروودا هاوەڵناوی کراوی داڕێژراو لە چاوگی تێپەڕ بەفڕێدانی نوونی چاوگ و زیادکردنی پاشگری ( ی ) دروست دەبێت وك :

| | |
|---|---|
| نڤیسین | نڤیسی + ی = نڤیسیی |
| خواندن | خواند + ی = خواندی |
| ئێخستن | ئێخست + ی = ئێخستی |
| کێلان | کێلا + ی = کێلای |

٣. چاوگە تێنەپەڕەکان هاوەڵناوی کراویان لێ دروست نابێ ( تەنیا چاوگە ئەلفییەکانیان نەبێت )، ئەم چاوگە ئەلفییانە هەر چەند تێنەپەڕیش بن بەلام چونکە لە پێکهاتندا لە چاوگە تێپەڕە نادیارەکان دەچن کە ئەوانیش هەموویان

دەبنە چاوگی ئەلفی بۆیە لە دروستکردنی هاوەڵناوی کراوی دارێژراو لەم چاوگە ئەلفییە تێنەپەڕانە، هەمان دەستوری وەرگرتنیان لە چاوگە تێپەڕە نادیارەکان بەکاردەهێنن ئەویش بە فڕێدانی نوونی چاوگ و زیادکردنی پاشگری ( و ) یان ( ی ) وەك:

| | | |
|---|---|---|
| سووتان | سووتا | سووتاو ( سووتای ) |
| برژان | برژا | برژاو ( برژای ) |
| لکان | لکا | لکاو ( لکای ) |

چاوگە تێنەپەڕەکانی تر، ئەم جۆرە هاوەڵناوەیان لێ دروست ناکرێت تەنیا هاوەڵناوی بکەری دارێژراویان لێ دێتە دروستکردن وەکو لە بابەتی پێشوو باسکرا.

٤. هەندێ جار لە چاوگی تێپەڕ دەتوانین هاوەڵناوی کراوی دارێژراو دروست بکەین بە وەرگرتنی قەدی چاوگ و زیادکردنی پاشگری ( ە ) وەك:

کوشتن: کوشت + ە = کوشتە

بردن : برد+ ە = بردە

هەڵبژاردن : هەڵبژارد + ە = هەڵبژاردە

## ڕاهێنان ( ١ )

لەم چاوگانە هاوەڵناوی کراوی دارێژراو دروستبکە:

فەوتاندن، پێچان، دانان، شکاندن، چەسپاندن

## ڕاهێنان ( ٢ )

هاوەڵناوی کراوی دارێژراو لەم ڕستانەدا دەربهێنە:

١- زەوی کێڵراو بە بڕشتە.

٢- گوندنشینەکان جۆی خوسێنراو دەدەن بە وڵاخەکانیان.

٣- شتی فرۆشراو وەرناگیرێتەوە.

٤- خوێندکارە بەخشراوەکان خەڵات کران.

## ڕاهێنان ( ٣ )

هاوەڵناوی کراوی دارێژراو لەم چاوگانە دروستبکەو لەڕستەدا بەکاریان بهێنە:

خزاندن، کڕاندن، تەکاندن، کرماندن، چەقاندن، شکاندن، خواردن، بینین.

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەرەوە:

١. جۆگەی هەڵبەستراو بەسوودە.

٢. نامەی نوسراو کۆ دەکاتەوە.

( وانەی نۆیەم )

# هاوەڵناوی کراو

## هاوەڵناوی کراوی لێکدراو

(١)

١. جوتیارە ستەملێکراوەکە زۆر هەژارو کەم دەرامەتە.

٢. مرۆڤی دڵسووتاو پێویستی بە دڵدانەوە هەیە.

٣. پرچی ڕەشداگیرساوی ئەم کچە نیشانەی لەش دروستییەتی.

٤. ئازادی دەستبڕاو (دەستبڕای) یەکێکە لە قوربانییانی ڕەفتاری چەوتی بەدکاران.

٥. دوژمنی تەنگ پێهەڵچنراو ناچار بوو خۆی بدا بەدەستەوە.

٦. پیاو نابێ دوای کڵاوی بابردوو بکەوێت.

(٢)

١. پێویستە چاودێری دڵسووتاوو ماڵوێرانی کارەساتی ئەنفال و بەعەرەب کردنی کەرکووک و گەرمیان بکەین.

٢. بەشخوراوان لە پێناوی وەدەستهێنانی مافەکانی خۆیان تێدەکۆشن.

٣. تەنگ پێهەڵچنراوان بە زووترین کات خۆیان بەدەستەوە دەدەن.

٤. بەکرێگیراوان تەمەنیان لە ناپاکی بەرامبەر بە گەلەکەیان بەسەر دەبەن.

## خستنه ڕوو:

هاوەڵناوی کراوی لێکدراو، ئەوەیە کە کردەوەیەکی بەسەرداهاتووە کردەوەکەش وەکو لە پێشدا لە باسی هاوەڵناوی کراوی داڕێژراودا ئاماژەمان پێکرد، بۆی بووە بە سیفەتێکی هەمیشەیی، بەڵام بکەری کردەوەکە دیار نییەو نازانین کێیە یان چییە.

ئەگەر چاوێك بەسەرجەم ڕستەکاندا بخشێنین دەبینین ئەو پەیڤانەی کە بوونە بە هاوەڵناوی کراوی لێکدراو، بە پێی چەند بنەمایێك ئەم بوونەیان پێدراوە کە بەم جۆرەیە:

ئـ -

١. لەڕستەی (١)ی کۆمەڵە ڕستەی ژمارە یەکدا، پەیڤی (ستەملێکراو) کە سیفەتێکی هەمیشەیی بە جوتیارەکە دەبەخشێتو لە ناوێكو قەدی چاوگی نادیاری (لێکرا)و پاشگری (و) دروستبووە. یان بە واتاییێکی دی دەتوانین بڵێین لە ناوێكو ڕەگی کاری چاوگی لێکردنو پاشگری (راو) دروستبووە.

٢. لە هەمان کۆمەڵە ڕستەدا ئەگەر تەماشای ڕستەی (٢) بکەین، دەبینین پەیڤی (دڵسوتاو) وەسفی ناوی (مرۆڤ)مان پێکردووە، ئەم پەیڤە بووە بە سیفەتێکی هەمیشەییو جۆری دروستکردنەکەی بریتییە لە ناوێكو قەدی چاوگی تێنەپەڕی (سووتان)و پاشگری (و)، لێرەدا پێویستە سەرنج لە چاوگەکە بدەین کە تێنەپەڕو ئەلفییە، ئەمەش لەوانەی ڕابردوو ڕوون کرایەوە.

٣. بەهــەمان شــێوەی ســەرەوە ڕســتەی (٣) پــەیڤێکی تێدایــە کــە سیفەتێکی هەمیشەیی بە پەیڤە وەسفکراوەکە دەبەخشێتو خۆشی وەکو ناوێکی گشتی پیشان دەدات. ئەم پەیڤە دەبێت بە هاوەڵناوی کـراوی لێکدراو بــە پێــی دەسـتورێکی تایبەتییـەوە دروسـت بـووە. پەیڤەکـەش بریتیـە لـە (ڕەشداگیرسـاو) کـە وەسـفی نـاوی (پـرچ) دەکاتو بووە بە سیفەتێکی هەمیشەیی بۆی، ئەم هاوەڵناوە کـراوە (بـەرکارە) لێکـدراوەش لـە هاوەڵناوێـکو قـەدی چـاوگی داڕێـژراوی تێنەپەڕی ئەلفی (داگیرسان)و پاشگری (و) دروستبووە.

هەروەها لەڕستەکانی تریش (دەستبڕاو، تەنگ پێهەڵچنراو، بـابردوو) هاوەڵناوی. کراوی لێکدراون.

ب– ئەگـەر سـەرنج لـە کۆمەڵـە ڕسـتەی ژمـارە (٢) بـدەین دەبینـین لـە هەریەك لەو ڕستانەدا پـەیڤێك یـان زیـاتر هەیـە کـە بەشـێوەیەکی پەیڤـە باسـکراوەکانی سـەرەوە دروسـتکراون، بـەڵام چـونکە ناوێـك یـان جێناوێکیان لە پێشەوە نـەهاتووەو ئـەو پەیڤانـە نەبوونەتـە سـیفەت بـۆ پەیڤی تر، بۆیـە نـاکرێ ناویـان بنـێین (هاوەڵنـاوی کـراوی لێکـدراو)، بـۆ نموونە:

– لەڕسـتەی (١)ی ئـەم کۆمەڵەیـەدا هـەردوو پـەیڤی (دڵسووتاو) و (ماڵڕمـاو) وەکـو ناوێـك لەڕسـتەکەدا بـەکارهاتوونو ئـەم دوونـاوەش ئەرکی بەرکاریان پێ هاتیتە سپاردنو لەدروستبوونیشیاندا لە ناوێكو قەدی چاوگێکی تێنەپەڕی ئـەلفیو پاشـگری (و) دروسـتکراون، بـەڵام نەبوونەتە سیفەتێکی هەمیشەیی بـۆ هـیچ ناوێـك یـان جێناوێـك، بۆیـە

لـەم بـارەدا دەكـرێ پێیـان بڵـێین (نـاوی كـراو)و لـە دروستبوونیـشدا لێكدراون.

- هەر بەم شێویە لە ڕستەی (٢)شدا پـەیڤی (بەشـخوراوان) ئـەركی بكـەری لەڕستـەكەدا هـەڵگرتووەو تایبەتمەنـدییێكی نـاوی پێوەیـە كـە ئەویش (كۆ)یە، وەسفی هیچ ناوێك یان جێناوێك ناكـات، تـەنیا ئەركـە تایبەتییەكـەی نـاو دەبینێـت، بۆیـە ئـەویش هـەر پێـی دەگـوترێ (نـاوی كـراو)و لێكدراویـشە، چـونكە لـەناوی (بـەش)و قـەدی چـاوگی نادیاری (خوران)و پاشگری (و) دروستبووە.

به هەمان شێوه پەیڤەكانی (تەنگ پێهەڵچنراو) و (بـەكرێگیراوان)یـش (ناوی كراو)ن و لێكدراویشن.

**دەستوور:**

**هاوەڵنـاوی كـراوی لێكـدراو پەیڤێكـە كـە كردەوەیـەكی بەسـەرداهاتووە، ئـەم كردەوەیە بۆی بووە بە سیفەتێكی هەمیشەیی، بەڵام نازانین كردەوەكـە لەلایـەن (كـێ) یان (چی)یەوە بەسەری داهاتووە، واتـا (بكەر)ی كردەوەكە دیار نییە، دیارە هاوەڵنـاوە كـراوە لێكدراوەكـە وەسـفی ناوێـك یـان جێناوێـك دەكـات كـە لـە پێـشییەوە هـاتووە، كاتێكیش هاوەڵناوەكە بە تەنیا بەكارهات، واتە هیچ ناوێك یـان جێنـاوێكی لەگەڵـدا بەكارنەهات ئەوا دەبێتە (ناوی كراو) كە وەكو ناوێك لە ڕستەدا بەكاردێت.**

**هاوەڵناوی كراوی لێكدراو یان (ناوی كراوی لێكدراو) بە زۆری لەچـاوگی لێكـدراوی تێپەڕ دەهێنە وەرگرتن، چونكە كاری تێپەڕ، بەركار وەردەگرێـت، هەرچـەندە دەتـوانین لە چاوگی تێنە پەڕی ئەلفیشەوە وەری بگرین هەروەك لەمەوبەر ئاماژەمان پێكرد.**

**دروستکردنی هاوەڵناوی کراوی لێکدراو، یان ( ناو کراوی لێکدراو ):**

ئەم جۆرە هاوەڵناوە بەزۆری لە چاوگە تێپەڕە لێکدراوەکان دروست دەکرێتو ئەم دروستکردنە بە پێی چەند بنەمایێك دێتە جێبەجێکردن بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. ناوێك لەگەڵ ( ڕەگی کار )و پاشگری ( راو ) یان ( رای ):

| چاوگ | ڕەگ | پاشگر | هاوەڵناوی کراو |
| --- | --- | --- | --- |
| سەرتاشین | سەرتاش + | راو ( رای ) | سەرتاشراو- سەرتاشرای |

٢. ناوێك یان هاوەڵناوێك لەگەڵ قەدی چاوگی ئەلفی تێنە پەڕو پاشگری ( و )یان ( ی ) وەك:

| چاوگ | قەد | هاوڵناوی کراو |
| --- | --- | --- |
| ڕەش هەڵگەران | ڕەش هەڵگەڕا | ڕەش هەڵگەڕاو ( ڕەش هەڵگەڕای ) |
| ماڵسووتان | ماڵسووتا | ماڵسووتاو ( ماڵسووتای ) |

هۆی دروستبوونی ئەم هاوەڵناوە لێکدراوانە لە چاوگە ئەلفییە تێنە پەڕەکان لەخاڵی سێیەمی دەستووری دروستکردنی هاوەڵناوی کراوی داڕێژراو ڕوون کراوەتەوە.

٣. ناو لەگەڵ قەدی چاوگی تێپەڕی ( دالی وتایی و واوی )و پاشگری ( وو ) یان ( ی )وەك:

با + بردن = بابرد + وو ( ی )، ە = ( با بردوو ( بابردی، بابردە )

کۆچ+ کردن = کۆچکرد + وو ( ی )، ە = کۆچکردوو ( کۆچکردی، کۆچکردە )

**تێبینی :**

لەو چاوگە لێکدراوانەی کە لەناوێك و چاوگێکی سادەی تێپەڕ پێکدێن دەکرێ هاوەڵناوی بکەری لێکدراوو هاوەڵناوی کراوی لێکدراویان لێ دروست بکەین، جا ئەگەر بمانەوێ جۆرێ هاوەڵناوی کراوی لێکدراو لە هاوەڵناوی بکەری لێکدراو جودا بکەینەوە پێویستە :

تەماشای پەیڤی پێش (کار)ەکە بکەین، ئەگەر ئەو پەیڤ (بکەر) بوو ئەوا تێکڕای بێژەکە دەبێتە هاوەڵناوی کراوی لێکدراو وەك:

(گورگ خواردوو) یان (گورگ خوارده)، کە لێرەدا ناوی گورگ (بکەر)ە، بۆیە (گورگ خواردوو) یان (گورگ خوارده) دەبێتە هاوەڵناوی کراوی لێکدراو.

بەڵام ئەگەر پەیڤی پێش کارەکە (بەرکار) بوو، ئەوا تێکڕای بێژەکە دەبێتە هاوەڵناوی بکەری لێکدراو، واتە بە پێچەوانەی یەکتری دەبن وەك: (گۆشت خواردوو) یان (گۆشت خوارده) کە لێرەدا پەیڤی گۆشت بەرکارە بۆیە تەواوی بێژەکە دەبێتە هاوەڵناوی بکەری لێکدراوو لە واتادا وەکو هاوەڵناوی (گۆشت خۆری) لێ دێت بۆ نموونە دەڵێن:

ئازادی گۆشت خواردوو هات.

بێژەی (گۆشت خواردوو) دەبێتە هاوەڵناوی بکەری لێکدراوو وەسفی ناوی (ئازاد)ی پێدەکەین.

جا لێرەدا هەردوو بێژەی (گۆشت خواردوو) و (گۆشت خۆر) هاوەڵناوی بکەری لێکدراون، جیاوازی نێوانیان ئەوەیە کە:

| | |
|---|---|
| گۆشت خواردوو | سیفەتێکی کاتی پێوەیە. |
| بەڵام گۆشت خۆر | سیفەتێکی هەمیشەیی بە خۆوە دەگرێت. |

## ڕاهێنان (١)

لەم دێرە هۆنراوانەدا هەرچی هاوەڵناوی کراوی داڕێژراوو لێکدراوت بەرچاو دەکەوێ دەریان بهێنەو شێوازی دروستکردنییان ڕوون بکەوە:

١. گەر دەپرسی دادوگریانو فوغانم بۆچییە
ڕاستە باوك مردەنیم ئەمما جگەر سووتاوی تۆم

(کوردی)

٢. گوڵ کە یاخیو دەم دڕاو بوو کەوتە لافی ڕەنگو بۆی
باغەبان گویێ گرتو دای هێنا بەدەستی بەستە بۆی

(نالی)

٣. فیداتم گیانە من داخ بردەی تۆم
توخوا دانیشە کەمێك لە گڵکۆم

(پیرەمێرد)

٤. دڵــێ هێلانــەی عەشــقی یــار نــەبێ
بـــەتیری نـــازی برینـــدار نـــەبێ
کوشتەی دوو دیدەی پڕ خومـار نـەبێ
بەجامێ شـەراب نەشئەی پـێ نـەدەی
خوایـە ئـەم دڵـە دائیم پەسـتی کـەی

(سەلام)

٥. ئەسیری میحنەتی هیجرانی تـۆم یـاری وەفـادارم
کوژراوی خەنجەری موژگانی تۆم مەحبووبی نازدارم

(ئەختەر کۆیی)

٦. بە شەستی زولفو ڕووی ماهی وەکو ماهی گرفتارم
گەهێ دڵگەستەی مـارم، گەهێ جانخەستەی نـارم

(حاجی کۆیی)

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. بۆچی هاوەڵناوی کراو بەزۆری لەو چاوگانە وەردەگیرێن کە تێپەڕن؟

٢. جیاوازی لەنێوان هاوەڵناوی کراوو ناوی کراو (چ داڕێژراو چ لێکدراو) چییە؟

٣. لەبەرچی دەتوانین هاوەڵناوی کراو لە چاوگە ئەلفییە تێنەپەڕەکان دروست بکەین؟

٤. چۆن هاوەڵناوی کراوی لێکدراوو هاوەڵناوی بکەری لێکدراو لە چاوگە لێکدراوەکان کە بە ناو دەست پێدەکەن لەیەک جیا دەکرێنەوە؟

٥. چۆن لەشێوەزاری کرمانجی ژووروودا هاوەڵناوی کراوی داڕێژراو دروست دەکرێت؟ بە نموونە ڕوونی بکەرەوە.

## ڕاهێنان (٣)

لە چاوگی (بردن، خواردن) بە چەند ڕێگا هاوەڵناوی بکەری لێکدراو، هاوەڵناوی کراوی لێکدراو دروست دەکرێت؟ نیشانی بدەو لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە.

## ڕاهێنان ( ٤ )

جۆرو شێوەی دروست کردنی ئەم هاوەڵناوانەی خوارەوە دیاربخە:

(ببەز- فرۆشراو- خوێندەوار- گەشبین- دەستبڕ- دەستکرد- ستەمبار- مارانگەستی - خۆشخوان- نەنووسراو )

## ڕاهێنان ( ٥ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە:

١. زەڤیا کێڵای نەفرۆشن.

٢. گەلی بەشخوراو داوای مافەکانی خۆی دەکات.

٣. چیرۆکێکی هەڵبژاردەم بەباشی خوێندەوە.

## ڕاهێنان ( ٦ )

جیاوازی لەنێوان هەردوو بێژەی (گۆشت خواردوو) و (گۆشت خۆر) چییە؟

١. لەڕووی دروستبوونەوە.

٢. لەڕووی مەبەستی بەکارهێنانەوە.

( وانەی دەیەم )

# هــاوەڵــکار

١. دوهی بەفر باری.

٢. دەرسەکەمان خێرا تەواو بوو.

٣. ئازادی کەو دناڤ هێلینێ داگرت.

٤. پووشەکە تۆزێ سووتا.

## خستنە ڕوو:

ئەگـەر سـەیری ڕسـتەکانی سـەرەوە بکـەینو لـە کارەکانیـان بـاش وردبینەوە دەبینین:

لەڕستەی یەکەمدا دەمانتوانی (مەدشیا) بێژین (بەفر باری) بـەڵام بـۆ ئـەوەی سـنوورێك بـۆ دەمـی ڕوودانـی کـاری ڕسـتەکە دابنـێین پـەیڤی (دوهی)مان بەکارهێناوە بەهۆیەوە توانیمان ڕوودانـی کارەکـەو ڕامانەکـە ژی بەتەواوی ئاشکرا بکەین.

- لەڕستەی دووەمـدا مـەڤیا چـەوانییا وێ تـەواو بـوونێ دەربخـەین لەبەر ئەوە پەنامان بردە بەر پەیڤی (خێرا)وە سنوورێکمان بـۆ واتـای کارەکە دانا.
- لە ڕستەی سێیەمدا ویستومانە شوێنی ڕووداوی کارەکە کە گرتنەکە یە پیشان بدەین بۆیە هاتووین هاوەڵکاری (دناڤ هێلینێ) مان بە کارهێناوە کە بە هۆیەوە سنوورێکمان بۆ واتای کارەکە داناو زانیمان کە ئازاد کەوەکەی لە ناو هێلانەکەدا گرتوە.
- لەڕستەی چـوارەمدا پـەیڤی (تـۆزێ) هاوەڵکـارە چـونکە وەسـفی (پەسـنی) کـاری (سـووتا)ی کـردووە. چـەندییە چـونکە ئەنـدازەی

سووتانی پووشەکەی بۆ دەرخستووین، ئەگەر ئەم پەیڤە لەڕستەکەدا نەبووایە نەمان دەزانی (مەنەدزانی) کە پووشەکە چەند سووتاوە، لەبەر ئەوە بەم پەیڤەیە دەگۆترێت (هاوەلکاری چەندیی).

## دەستوور:

**هاوەڵکار/ پەیڤەکە ڕوویەکی ڕوودانی کاری ڕستە دەربارەی ( چۆنیەتی ئەو ڕوودانە، یان کاتی، یان شوێنی، یان چەندیی ) دەردەخاتو لەم ڕووەوە سنورێك بۆ تەواوکردنی واتاکەی ( ڕاماناکەی ) دادەنێت.**

# تەواوکردنی کار بە هاوەڵکاری کاتی

**ئەم ڕستانە بخوێنەوە:**

**١- هەڵەبجە لە شازدەی ئازاردا کیمیا باران کرا.**

**٢- شڤان ژمێژە نقستییە.**

**٣- کوردستان لەسەدەی بیستەمدا جارێکی تر دابەشکرایەوە.**

**٤- گەلی کورد لە پێنجی ئازاردا ڕاپەڕی.**

**٥- هەڤاڵ سوبەهی دێ ڤەگەڕێتە دهۆکێ.**

**٦- کورد هەرگیز واز لە ئازادی ناهێنێت.**

## خستنە ڕوو:

لەم ڕستانەی سەرەوەدا کارەکان بە هاوەڵکار تەواوکراون، لەڕستەی یەکەمدا **گرێی** (لە شازدەی ئازار) کاتی کیمیابارانی شاری هەڵەبجە نیشان دەداتو دەردەخات، بۆیە پێی دەوترێت هاوەڵکاری کاتیو دەبێتە تەواوکەری کاری ڕستەکە. لەڕستەی دووەمدا (ژمێژە) کاتی نووستنی (شڤان) نیشان دەداتو دەردەخات لەبەر ئەوە هاوەڵکاری کاتییەو تەواوکەی کاری ڕستەکەیە.

لەڕستەی سێیەمدا **گرێی** (لەسەدەی بیستەمدا) کاتی دابەشکردنی وڵاتی کوردستان بۆ جارێکی تر دەست نیشان دەکاتو بۆیە هاوەڵکاری کاتییە دەبێتە تەواوکەری کاری ڕستەکە.

لەڕستەی چوارەمدا **گریّی** (لە پیّنجی ئازار) هاوەلّکارە بەلاّم چونکە کاتی ڕاپەڕینی کورد دەردەخات بۆیە هاوەلّکاری کاتیەو تەواوکەری کاری ڕستەکەیە.

لەڕستەی پیّنجەمدا پەیڤی (سوبەهی) کاتی گەڕانەوەی (هەڤالّ) نیشان دەدات بۆ شاری (دهۆك) بۆیە هاوەلّکاری کاتییەو تەواوکەری کاری ڕستەکەیە.

لەڕستەی شەشەمو دیماهیدا پەیڤی (هەرگیز) ئەوە دەردەخات کە هیچ کاتیّك کورد واز لە بیری ئازادی ناهیّنیّت بۆیە هاوەلّکاری کاتییەو تەواوکەری کاری ڕستەکەیە.

## دەستوور:

**هاوەلّکاری کاتی ئەو هاوەلّکارەیە کاتی ڕوودانی کاری ڕستە دەردەخاتو نیشان دەداتو دەبیّتە تەواوکەری کاری ڕستەکە چ ڕابردوو بیّت یان ڕانەبردوو یان داخوازی، کاری ڕستەکە تیّپەڕ بیّت یان تیّنەپەڕ، هەروەها دەبیّتە تەواوکەری کاری ناتەواو... وەلاّمی پرسیاری (کەی، کەنگی، لە کەیەوە، چ کاتیّ) دەداتەوە ئەمانەش بەشیّکن لە هاوەلّکاری کاتی (ئیّستا، ئەمڕۆ، سبەهی، پشتی نیڤڕۆ، نهۆ، لەم ڕۆژانەدا، چەند ڕۆژیّکی دی، بەم زووانە، بەهاریّ، ئیرۆ، ئیّڤاریّ، جاران، ئەمسالّ، لەمیّژە، هەندیّ جار، هەمیشە، لەمەولا، تا بەیانی، لەوساوە، بەریّ، پیّریّ، سوبەهی...هتد).**

**تێبینی:**

**هاوەڵکار کە دەبێتە تەواوکەری کار نەدەبێتە بەرکارو و نەدەبێتە تەواوکەری بەیاریدە، و چونکە لە بنەڕەتدا بۆ ئەوەیە کە کاتی ڕوودانی کارەکە یا شوێنی ڕوودانی یان چۆنیەتی ڕوودانی کارەکە دەربخات... وەکو یەکو بەیەك شێوە دەبێتە تەواوکەری کاری تێپەڕو تێنە پەڕ.**

## ڕاهێنان (١)

لەم دێرە هۆنراوانەدا هاوەڵکارەکان دەربهێنەو شییان بکەرەوە:

ئەزانی بۆچی وا کورد زەلیله ! ؟

بێ ناونیشان هەمیشە دیـلە ؟

کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشتو کێو شینە

چەندە مەڵبـەندی ئێـمە شیرینـە

هیوام بەتۆیە ئەی تازە منالْ

بەیانی ببیە نموونەی میسـال

ئەگەرچی شەو درەنگە ساقی بۆم تێکە کەمێکی تـر

کەوا ئەمشەو سـەری هەڵدا لـەنـاخمدا خەمــێکی تر

(هێمن)

## ڕاهێنان (٢)

هاوەڵکارەکانی (بەم زووانە– نهۆ– لەوساوە) لە ڕستەدا بەکاربهێنە بە مەرجێك هاوەڵکاری یەکەمو دووەم ببن بە تەواوکەری کاری تێنەپەڕو هاوەڵکاری سێیەمیان ببێت بە تەواوکەری کاری تێپەڕ.

## ڕاهێنان (٣)

لە ڕستەی (ئەڤرۆ دڤێت کوردستان ژ هەموو لایاڤە پێش بکەڤیت).

١. (ئەڤرۆ) چییە؟ ئەرکی چییە؟

٢. بکەری ڕستەکە دەربخە.

٣. (پێش بکەڤیت) چ جۆرە کارێکە؟ چۆن دروست کراوە؟

٤. ڕستەکە بگۆڕە سەر شێوەی زاری کرمانجی خواروو سەر لەنوێ ڕستەکە بنووسەرەوە.

( وانەی دوازدەم )

# تەواوکردنی کار بە هاوەڵکاری شوێنی

ئەم هۆنراوانە بخوێنەوە:

١- لەژێر ئاسمانی شـــینا
لەپاڵ لووتکەی بەفرینـا
کوردستان گـــــــەڕام
دۆڵاو دۆڵ پیـــــــوام

گۆران

٢-جۆشش و تابە لەنێو دیدەیی گریانمدا
چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی تۆفانمدا

٣-لەژێر زەردەی خـۆرەتـــــاوا
بەناو چیمەنی گویَ ئـــاوا

گۆران

٤-مـــیری پادشـــاهی مووبـــەك ل نـــك مـــەلاییَ
نادەم بە موڵکیَ عالەم یەك زەڕە یەك عینایەت

٥-قەسدی یـاریتـە لەکن بەزمی ڕەقـــــیب
یاری منە، خۆت مەکە بەدخوو بە عەبـــــەث

مەلاییَ جزیری

## خستنە ڕوو:

لەم نموونانەی سەرەوەدا کارەکان بە هاوەڵکار تەواوکراون، لە نموونەی یەکەمدا پەیڤەکانی (لەژێر) (لەپاڵ) شوێنی ڕوودانی کارەکە دەردەخەن، بۆیە دەبنە هاوەڵکاری شوێنیو دەبنە تەواوکەری کارەکان...

لە نموونەی دووەمدا پەیڤی (لەنێو) شوێنی کاری ڕستەکە دەردەخات بۆیە هاوەڵکاری شوێنییەو تەواوکەری کاری ڕستەکەیە...

لە نموونەی سێیەمدا پەیڤەکانی (لەژێر)و (بەناو) شوێنی ڕوودانی کارەکە دەردەخەن بۆیە هاوەڵکاری شوێنینو دەبنە تەواوکەری کاری ڕستەکە....

لە نموونەی چوارەمدا پەیڤی (ل نك) شوێنی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخاتو دەبێتە هاوەڵکاری شوێنی لە نموونەی پێنجەمدا پەیڤی (لەکن) هاوەڵکاری شوێنییەو دەبێتە تەواوکەری کاری ڕستەکە...

## دەستوور:

**هاوەڵکاری شوێنی ئەو هاوەڵکارەیە شوێنی ڕوودانی کاری ڕستە نیشان دەداتو دەردەخات، وەڵامی وشەی پرس ( لەکوێ، لە کێندەرێ، بۆ کوێ ) دەداتەوە...**

**ئەمانەش بەشێکن لە هاوەڵکارە شوێنییەکان ( سەر، ژێر، خوار، بن، کن، پاش، پێش، لەبن، لەسەرەوە، نێو، ناو، تەنیشت، چەپ، ڕاست، لەوێ، لێرە، ژ خارێ، ل نك، دناڤ ، خارێ، ژێری، ژووری، بنرا، لەناو ئەشکەوتەکە، لەسەردارەکە، لەبنەوە...هتد ).**

## ڕاهێنان ( ١ )

لەم ڕستانەدا هاوەڵکارەکان دەربهێنەو شییان بکەرەوە:

١. ڕۆژ لەڕۆژهەڵاتەوە بەرز دەبێتەوە.

٢. ئاڵای کوردستان لەسەر لووتکەی شاخەکە دەشەکێتەوە.

٣. شڤانەکە ل خارێ ڕوونیشتییە.

٤. ل نك مرۆڤێ نەخۆش نەڕوینە.

٥. شڤان ژ خوارێ چوو سەرێ.

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەم هاوەڵکارانەی خوارەوە چ جۆرێکن، لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە:

(ل جەم، پار، باکوور، بەربانگ، نیڤ شەڤ ، ئێستا)

## ڕاهێنان ( ٣ )

نیوەی یەکەمی ئەم دێرە هۆنراوەی (گۆران) شیبکەوە.

بە باغچەی پاشادا ورد گەڕام خوارو ژوور
زەرد هەبوو، بۆم چنیت، چنگ نەکەوت گوڵی سوور

( گۆران )

## ڕاهێنان ( ٤ )

پارچە نووسینێك لەسەر هێرشە ناڕەواکانی ئەنفال بنووسە بۆ سەر هەموو ناوچەکانی کوردستانی عێراق لەساڵی ١٩٨٨ ئینجا هاوەڵکارە شوێنییەکان دەربهێنە.

# تەواوکردنی کار بە هاوەڵکاری چۆنیەتی

**ئەم نموونانە بخوێنەوە:**

**١. ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە**
**جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشیو بەهاتەوە. (پیرەمێرد)**

**٢. بە باخچەی پاشادا ورد گەڕام خوارو ژوور**
**زەرد هەبوو، بۆم چنیت، چنگ نەکەوت گوڵی سوور (گۆران)**

**٣. لە پاداشتی قسەی سەردا هەمە ئاهو هەناسەی گەرم**
**کەسێ شێتانە بەردم تێگرێ من بەرقی تێ دەگرم (نالی)**

**٤. هەڤاڵ ب دڵگەشی چوویە ماڵ**

**٥. دارشتنەکە ب قنجی هاتە نڤیسین**

**خستنە ڕوو:**

لەم نموونانەی سەرەوەدا کارەکان بە هاوەڵکارێ تەواوکراون، لە نموونەی یەکەمدا پەیڤی (بەخۆشی) چۆنیەتی هاتنەوەی جەژنی نەورۆزی کوردان دەردەخات، بۆیە هاوەڵکاری چۆنیەتییەو تەواوکەری کاری ڕستەکەیە...

له نموونەی دووەمـدا پـەیڤی (ورد) چـۆنیەتی گـەڕانی شـاعیر نیـشان دەدات بۆیە هاوەڵکاری چۆنیەتییەو تەواوکەری کاری ڕستەکەیە...

لـە نموونـەی سـێیەمدا پـەیڤی (شـێتانە) چـۆنیەتی بـەرد تێگـرتن دەردەخـات لەشـاعیر بۆیـە هاوەڵکـاری چـۆنیەتییەو تەواوکـەری کـاری ڕستەکەیە...

لـە نموونـەی چـوارەمدا پـەیڤی (ب دلگەشـی) چـۆنیەتی چـوونەوەی هەڤاڵ نیشان دەدات بۆ ماڵەوە بۆیە هاوەڵکاری چـۆنیەتییەو تەواوکـەری کارەکەیە...

له نموونەی پێنجەمیشدا پـەیڤی (ب قنجـی) چـۆنیەتی نووسـینەوەی داڕشتنەکە دەردەخات بۆیـە هاوەڵکـاری چـۆنیەتییەو تـەواوکـەری کـاری ڕستەکەیە....

## دەستوور:

**هاوەڵکاری چـۆنیەتی ئـەو هاوەڵکارەیـە کـە چـۆنیەتی ڕوودانـی کـاری ڕسـتە نیشان دەداتو وەسفی کاری ڕستەکە دەکات، وەڵامـی وشـەی پرسـی ( چـۆن، کـوو، چەوان ) دەداتەوە ئەم وشانەش بەشێکن لە هاوەڵکارە چۆنیەتییەکان.**

**( شـێرانە، ئازایانـە، مەردانـە، ژیرانـە، بـەگریان، بـەڕاکردن، شـێتانە، بەگەرمی، بەساردی، بەباشـی، بەخۆشـی، بەناخۆشـی، بـەتووڕەیی، دەمـاو دەم، پشتاو پـشت، ب قنجـی، بـە دروسـتی، مێرانـە، ب دینـی، ب پـاکی، ب لـەزی... هتد ):**

**تێبینی:**

هەندێك وشە هەن ئەگەر لەڕستەدا وەسفی ناوێك یان جێناوێك بکەن، یاخود ببنە تەواوکەری کارێکی ناتەواو ئەوە دەبنە هاوەڵناوی چۆنیەتی (جوان، باش، خراپ، ڕێك، بەرز، چاك، توند...هتد) وەکو:

نمرەکانم باش بوون.

نمرەیەکی باشی لەکوردی وەرگرتووە.

باخچەیەکی جوانیان هەیە.

هۆنراوەکانی بەرزن.

لەڕستەکانی سەرەوەدا وشەکانی (باش، جوان، بەرز) هاوەڵناوی چۆنیەتین چونکە وەسفی ناوەکان دەکەن لەڕستەکاندا... بەڵام ئەگەر ئەم وشانە وەسفی کارێکی تەواو بکەن لەڕستەدا ئەوە دەبنە هاوەڵکاری چۆنیەتی و دەبنە تەواوکەری کاری ڕستەکە وەکو:

وانەکانم باش خوێند.

باخچەکەیان جوان ناو دابوو.

هۆنراوەکەی بەرز هەڵسەنگاندووە.

بەڵام لەم ڕستانەی سەرەوەدا وشەکانی (باش، جوان، بەرز) چونکە وەسفی کاری ڕستەکان دەکەن و چۆنیەتی ڕوودانی کارەکان نیشان دەدەن بۆیە دەبن بە هاوەڵکاری چۆنیەتی و دەبنە تەواوکەری کاری ڕستەکان.

## ڕاهێنان ( ١ )

لەم ڕستانەدا ئەوانەی هێلیان بەژێردا هاتووە شیبکەوە:

١. کوردستان بەدڵرەقی وێرانکرا بوو.

٢. گەلی کورد شێرانە ڕاپەڕی.

٣. زەوییەکەی بەجوانی کێڵا .

٤. ئەم ب تەڤایی شولێ خۆ دکەین.

٥. مرۆڤێ لەزگینی ب لەز هاتن.

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەم وشانە لەڕستەدا بەکاربهێنە بە مەرجێك جارێك ببنە هاوەڵناو جارێکی تریش ببنە هاوەڵکاری چۆنیەتی:

١. خراپ ٢. چاك ٣. جوان ٤. باش ٥. بەرز.

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:

١. مەلەوانەکە بە مەلە لەڕووبارەکە دەربازبوو.

٢. فراڤینێ ب گەرمی بخۆ.

٣. ڕاوکەرەکان بەسواری چوون بۆ ڕاو.

## ڕاهێنان (٤)

هاوەڵکارەکان لەم نموونانە دەربهێنەو جۆرەکانیان دەست نیشان بکە:

١. لەناو خوێندا دەتلێتەوە لاوی بەزیپکو بەسەبات
بەلام هەروا دەچێتە پێش بێ وچان کاروانی خەبات

٢. لە خەودا دیم لەسەر هەلگورد
لەسەر چیای سەرکەشی کورد
لە فریشتان بەرزتر بوو جێم
هەور دەڕۆین لەبەر پێم (هێمن)

٣. کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو
لەبنیا بلەرزێ مرواریی زیخو چەو
جوانترە لەلای من لەدەریای بێ سنوور
شەپۆلی باتە بەرتیشکی خۆر شلپو هۆڕ (گۆران)

٤. لۆ پێکڤە هەمیشە بێ تفاقن
دائیم بە تەمەرودو شقاقن (خانی)

٥. لەچوار چرای مەهاباد / لەکانگای بیری ئازاد
لەکاتی نیوە شەوا / لەجەنگەی شیرن خەوا
کرا کاری ناڕەوا / لەدار درا پێشەوا
(هێمن)

# تەواوکردنی کار بە

## هاوەڵکاری ڕێکخستن

١. پیاوەکان دەستە دەستە دەهاتن.

٢. باران تاڤ تاڤ دباریت.

٣. لاوەکان کۆمەڵ کۆمەڵ ڕاوەستابوون.

٤. ئەم وە جار جار دبینین- ئێمە جار جار دەتانبینین

٥. منداڵەکە ئاوەکەی قوم قوم خواردەوە.

٦. ئەو ئاڤێ فرفر ڤەدخۆت.

٧. پێشمەرگەکان پۆل پۆل گەیشتنە جێ.

٨. کەو برِبرِ فرِین.

٩. کۆترەکان جووت جووت هەڵنیشتن.

١٠. زارۆ سێ سێ رِۆیشتن.

**خستنە ڕوو:**

ئەگەر سەرنج بدەینە رِستەکانی سەرەوە دەبینین پەیڤی (دەستە دەستە، تاڤ تاڤ ، کۆمەڵ کۆمەڵ ، جار جار، قوم قوم، فرِفرِ، پۆل پۆل، برِ برِ، سێ سێ) کە رِێکخستنو ریزکردنیان تێدایە پێیان دەوترێت هاوەڵکاری رِێکخستن چونکە:

١. لەڕستەی یەکەمدا پەیڤی (دەستە دەستە) هاوەڵکاری ڕێکخستنە چونکە واتای کاری (دەهات)ی تەواوکردووەو شێوەی ڕوودانی کارەکەی دەرخستووە، ئەگەر وشەی (دەستە دەستە) نەبووایە نەمان دەزانی کە کارەکە بە چ شێوەیەك ڕووی داوە.

٢. لەڕستەی دووەمدا پەیڤی (تاڤ تاڤ ) هاوەڵکاری ڕێکخستنە چونکە واتای کاری (دباریت) تەواو دەکاتو شێوەی ڕوودانی کارەکە دەردەخات، ئەگەر پەیڤی (تاڤ تاڤ ) نەبێت لەڕستەکەدا نازانین کە کارەکە بە چ شێوەیەك ڕوو دەدات.

٣. لەڕستەی سێیەمدا پەیڤی (کۆمەڵ کۆمەڵ ) هاوەڵکاری ڕێکخستنە چونکە شێوەی ڕوودانی کاری (ڕاوەستابوو)ی دەرخستووەو واتای کارەکەشی تەواوکردووە، ئەگەر وشەی (کۆمەڵ کۆمەڵ ) نەبووایە نەمان دەزانی کە کارەکە بە چ شێوەیەك ڕووی داوە.

٤. لەڕستەی چوارەمدا پەیڤی (جار جار) هاوەڵکاری ڕێکخستنە چونکە شێوەی ڕوودانی کاری (دەبینین) دەردەخاتو واتای کارەکەش تەواو دەکات، ئەگەر وشەی جار جار لەڕستەکەدا نەبێت نازانین کە کارەکە بە چ شێوەیەك ڕوو دەدات.

٥. لەڕستەی پێنجەمدا پەیڤی (قوم قوم) هاوەڵکاری ڕێکخستنە چونکە شێوەی ڕوودانی کاری (خواردەوە)ی دەرخستووەو واتاشی تەواوکردووە، ئەگەر پەیڤی (قوم قوم) نەبووایە نەمان دەزانی کە کارەکە بە چ شێوەیەك ڕووی داوە.

٦. له ڕستەی شەشەمدا پەیڤی (فڕ فڕ) هاوەڵکاری ڕێکخستنە، چونکە شێوەی ڕوودانی کاری (ڤەدخۆت) دەردەخاتو واتاشی تەواو دەکات، ئەگەر پەیڤی (فڕ فڕ) لەڕستەکەدا نەبێت نازانین کە کارەکە بە چ شێوەیەك ڕوودەدات.

٧. لە ڕستەی حەوتەمدا پەیڤی (پۆل پۆل) هاوەڵکاری ڕێکخستنە، چونکە شێوەی ڕوودانی کاری ( گەیشت) دەردەخات واتاشی تەواوکردووە، ئەگەر پەیڤی (پۆل پۆل) نەبووایە، نەمان دەزانی کە کارەکە بە چ شێوەیەك ڕووی داوە.

٨. لە ڕستەی هەشتەمدا پەیڤی (بڕ بڕ) هاوەڵکاری ڕێکخستنە، چونکە شێوەی ڕوودانی کاری (فڕی)ی دەرخستووەو واتاشی تەواو کردووە، ئەگەر پەیڤی (بڕ بڕ) نەبووایە، نەمان دەزانی کە کارەکە بە چ شێوەیەك ڕووی داوە.

٩. لە ڕستەی نۆیەمدا پەیڤی (جووت جووت) هاوەڵکاری ڕێکخستنە، چونکە شێوەی ڕوودانی کاری (هەڵنیشت)ی دەرخستووەو واتاشی تەواوکردووە، ئەگەر پەیڤی (جووت جووت) نەبووایە، نەمان دەزانی کە کارەکە بە چ شێوەیەك ڕووی داوە.

١٠. لە ڕستەی دەیەمدا پەیڤی (سێ سێ) هاوەڵکاری ڕێکخستنە، چونکە شێوەی ڕوودانی کاری (ڕۆیشت)ی دەرخستووەو واتاشی تەواو کردووە، ئەگەر پەیڤی (سێ سێ) نەبووایە، نەمان دەزانی کە کارەکە بە چ شێوەیەك ڕووی داوە.

**دەستوور:**

**هاوەڵکاری ڕێکخستن ئەو هاوەڵکارەیە کە لەڕستەدا شێوەی ڕێکخستنی ڕوودانی کارەکە دەردەخات و واتاشی تەواو دەکات، هەمیشە دەبێتە تەواوکەری کاری تەواو لەڕستەدا، وەکو: (دەستە دەستە، پۆل پۆل، جار جار، تاقم تاقم، جوان جوان، کۆمەڵ کۆمەڵ، سێ سێ، شەش شەش، ....).**

## ڕاهێنان (١)

ئەم هاوەڵکارە ڕێکخستنانەی خوارەوە لەڕستەدا بەکاربهێنە:

(ناوە ناوە – تاو تاو – گاڤ گاڤ – ورد ورد – هێدی هێدی – خێرا خێرا – تاقم تاقم – بڕ بڕ – تنۆك تنۆك)

## ڕاهێنان (٢)

لەم دێرە هۆنراوەی خوارەوەدا:

چاوی من دەم دەم دەڕێژێ ئاوی ساف و خوێنی گەش

تا بڵێن دەریایی عومانە دوڕ و مەرجانی هەیە. (نالی)

ئـ– وشەی (دەم دەم) چییەو ئەرکی چییە؟

ب– وشەی (چاو) شی بکەوە.

پ– وشەی (ساف، گەش) شی بکەوە؟

ت– وشەی (ئاو، خوێن) ئەرکیان چییە؟

ج– وشەی (دوڕ، مەرجان) شی بکەوە.

ح– وشەی هەیە شی بکەوە.

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە:

١. دوهی قوتابیان کۆمەڵ کۆمەڵ بلەز دهاتنە خاندنگەهێ.

٢. یاریزانەکان دوو دوو بە مەشق دەڕۆن.

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەم پرسیارانە بە هاوەڵکاری ڕێکخستن وەڵام بدەوە:

١. میوانەکان چۆن دەهاتن؟

٢. گەنمەکە چۆن دروێنە کراوە؟

٣. یاریکەرەکان چۆن بە مەشق دەڕۆن؟

٤. سانا ئاوەکەی چۆن خواردەوە؟

# تەواوکردنی کار بە

## هاوەڵکاری چەندی

١. من دلبەرەك وەك دورٍ هەیـــە
مەحبوب و شیرین سورٍ هەیـــە
حوسن و جەمالەك پورٍ هەیـــە
بەلقیس سیفەت مەسکەن سەبا

(جزیری)

٢. هەتاوی نەورۆز مانگی جـۆ درەو
زۆر هاتوون و چوون بە ڕۆژ بەشەو

(گۆران)

٣. لە گەرووی شمشاڵ لە تەلی کەمـان
گەلێ هەڵساوە ئاوازەی جوان جوان

(گۆران)

٤. ئوتو بەند دبی زمان لالۆمـــە
بەلێ فەعم دکەم ئەز ژ روحێ تە
بەلێ کێم دبهێم خەبەرێ تـەدوور
حەزنافیکراتە، بەحرا بێ بوحوور

(جاسمی جەلیلی)

**٥. بەسەرهاتی خۆت بۆمن بەیان کە**
**دەردی گرانم نەختێ ئاسان کە**

**٦. ئەوەندەم بیست لە مۆسیقا خرۆشی ڕۆحی بێگانە**
**میزاجی کوردەواریم تێکچووە دەروێش عەبدوللا**

(گۆران)

**خستنە ڕوو:**

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم دێرە هۆنراوانەی لای سەرەوە دەبینین:

١. لەدێرە هۆنراوەی یەکەمدا پەیڤی (پوڕ– پڕ) هاوەڵکاری چەندییەو تەواوکەری کاری (هەیە)یە، چونکە چەندێتی ڕوودانی کاری (هەیە) دەردەخات.

٢. لەدێرە هۆنراوەی دووەمدا پەیڤی (زۆر) هاوەڵکاری چەندییەو تەواوکەری کاری (هەڵساوە)یە، چونکە چەندێتی ڕوودانی کارەکەی دەرخستووە.

٣. لەدێرە هۆنراوەی سێیەمدا پەیڤی (گەلێ) هاوەڵکاری چەندییەو تەواوکەری (هات، چوو)ە، چونکە چەندێتی ڕوودانی کارەکەی دەرخستووە.

٤. لەدێرە هۆنراوەی چوارەمدا پەیڤی (کێم) هاوەڵکاری چەندییەو تەواوکەری کاری (دبهێم)ە چونکە چەندێتی ڕوودانی کارەکە دەردەخات.

٥. لەدێڕە هۆنراوەی پێنجەمدا پەیڤی (نەختێ) هاوەڵکاری چەندییەو تەواوکەری کاری (ئاسان کە)یە، چەندییە چونکە چەندێتی ڕوودانی کارەکە دەردەخات.

٦. لەدێڕە هۆنراوەی شەشەمدا پەیڤی (ئەوەندە) هاوەڵکاری چەندییەو تەواوکەری (بیست)ە، چەندییە چونکە چەندێتی ڕوودانی کاری (بیست)ی دەرخستووە.

## دەستوور:

**هاوەڵکاری چەندیی: ئەو هاوەڵکارەیەکە لەڕستەدا چەندێتی (بڕی) ڕوودانی کارێکی تەواو (تێپەڕو تێنەپەڕ) نیشان دەداتو دەبێتە تەواوکەری کارەکە. وەکو: (زۆر، کەم، کێم، گەلێك، تۆزی، هەندێك، نەختێ، پوڕ، پیچێك، فرە، کۆلێ، ...).**

## ڕاهێنان (١)

ئەم هاوەڵکارە چەندییانە لەڕستەدا بەکاربهێنە بە مەرجێك سێیانیان ببنە تەواوکەری کاری تێپەڕ، سێیانیان ببنە تەواوکەری کاری تێنەپەڕ:

(کۆلێ– فرە– هەندێك– پیچێك– گەلێك– کەم )

## ڕاهێنان (٢)

لەڕستەی (بەڵێن هۆنراوەی گەلێك لەبەرکردووە):

ئـ– (ی) لەدوای وشەی هۆنراوە چییەو ئەرکی چییە؟

ب- بکەری ڕستەکە دیار بخە.

پ- وشەی گەلێك چ جۆرە هاوەڵکارێکە؟ ئەرکی چییە؟

ج- کام وشە بەرکاری ڕستەکەیە؟

ح- کاری (لەبەرکردووە) بە چەند جۆرە هاوەڵکاری تر دەتواندرێ تەواو بکرێت؟ بە نموونە نیشانی بدە.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم دێرە هۆنراوەیەی خوارەوە شی بکەوە:

گەلێکم ڕۆژگاری تاڵ و شیرین ڕابوارد، ئاخۆ

مەرگ مەودا دەدا دیسان ببینم، سەردەمێکی تر (هێمن)

## ڕاهێنان (٤)

کاری ئەم ڕستانە بەهاوەڵکارێکی چەندیی تەواو بکە.

١. ئەلەند دوێنێ ڕایکرد.

٢. منداڵەکە ئاوی خواردەوە.

٣. نەخۆشەکە دەکۆکێت.

٤. کەوەکە دەخوێنێت.

٥. چێشتەکە ساردبووەوە.

## ڕاهێنان (٥)

ئەم هاوەڵکارانە لەڕستەدا بەکاربهێنەو جۆرەکانیان نیشان بدە:

(هەمیشە، گەلێ، بەخێرایی، پێرار، تاو تاو، تیپ تیپ، لەناوەڕاست)

# ئەرکی هاوەڵکار لەڕستەدا

١. پار چووین بۆ دهۆك.
٢. ئاڤ گەلەك زوو کەلی.
٣. پێڵاوەکەم بە پەلە لەپێ کرد.
٤. مە ماسی دناڤ گۆمێ دا گرتن.

## خستنە ڕوو:

مەزانی کۆ هاوەڵکار ئەو بەشەیە کە سنوورێك بۆ ڕوودانی واتای کاری ناو ڕستە دادەنێتو ڕوویەکی ڕوودانی ئەو کارە ئاشکرا دەکاتو دەبێتە تەواوکەری واتای کارەکە.

لێرە مە دڤێت ئەرکی هاوەڵکار لەناو ڕستەدا بخەینە بەرچاو:

لەڕستەی یەکەمدا هاوەڵکاری (پار) سنوورێکی بۆ دەمی ڕوودانی کاری ڕستەکە داناوەو بووە بە تەواوکەری ڕامانو مەبەستی کارەکە.

لەڕستەی دووەمدا هاوەڵکاری (زوو) تەواوکەری کاری (کەلی)یە، بەڵام بۆ دەرخستنی ئەندازەی ئەو (زوو)وەو دیارخستنی واتاکەی هەوەڵکارێکی ترمان لە پێشەوە بەکارهێنا کە (گەلەك)ە، لەم ڕستەیەدا هاوەڵکاری (گەلەك) دیارخەری هاوەڵکاری (زوو)وەو هەردوو پێکڤە ڕامانا کاری تەواو دەکەن.

ئەگـەر جـارێکی تـر لـە ڕسـتەکانی (٢,١) وردبینـەوە، دەبیـنین هاوەڵکارەکان بەبێ ئـامرازی پەیوەنـدی دەوری خۆیـان وەك تەواوکـەری کارەکان دەبینین.

بەڵام لەڕستەی (٣)دا پـەیڤی (پەلـە) بـەهۆی پێشگری (بـە) دەوری خۆی وەکو هاوەڵکار دەبینیو دەبێتە تەواوکەری کارەکە.

لەڕستەی چوارەمیشدا هاوەڵکاری (ناڤ گۆمێ) بـە یاریدەی ئـامرازی پەیوەندی (د...دا ) بووە تەواوکەری کاری ڕستەکە.

## دەستوور:

١. **هاوەڵکار لەناو ڕستەدا ڤان ئەرکێت خوارێ دبینیت.**

**ئـ- دەبێتە تەواوکەری کار.**

**ب- دەبێتە دیارخەری هاوەڵکارێکی ترو هەردوو پێکڤە دبنە تەواوکەر بۆ کارەکە.**

٢. **هاوەڵکار هەمیشە دەبێتە تەواوکەری ڕاستەوخۆی کاری ڕستەکە.**

## ڕاهێنان (١)

ئەم ڕستانە دروست بکە:

١. ڕستەیەك هاوەڵکارەکەی دیارخەری هاوەڵکارێکی تر بێت.

٢. ڕستەیەك هاوەڵکارەکەی لە پەیڤێكو پێشگرێك دروست کرابێت.

٣. ڕستەیەك هاوەڵکارێکی شوێنی تێدابێت.

٤. ڕستەیەك هاوەڵکارێکی چۆنیەتی تێدابێت.

٥. ڕستەیەك هاوەڵکارێکی ڕێکخستنی تێدابێت.

## ڕاهێنان (٢)

لەڕستەی (پێشمەرگەکان پۆل پۆلو زۆر بەخێرایی لەڕووبارەکە دەپەڕینەوە):

ئـ- (پۆل پۆل) چییە؟ ئەرکی چییە؟

ب- بکەری ڕستەکە شی بکەوە.

پ- (زۆر بەخێرایی) چۆن شی دەکرێتەوە؟

ت- کاری ڕستەکە دیار بخەو بزانە چ جۆرە کارێکەو چۆن دروست ج- بووە؟

ج- ئایا دەکرێ هەردوو بێژەی (پۆل پۆل) و (زۆر بەخێرایی) لەڕستەدا لاببرێ؟ بۆچی؟

چ- ڕستەکەی سەرەوە بەزاراوەی کرمانجی ژووروو بنووسەوە.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم هاوەڵکارانە لەڕستەدا بەکاربهێنە:

(زۆرباش، گەلێك جوان، تۆزێك بەخێرایی، هەندێك بەهێواشی)

## ڕاهێنان (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە:

١. مامۆستایێ مە وانێ باش دبێژیت.

٢. مەلەوانەکە زۆر بەخێرایی منداڵەکەی ڕزگارکرد.

٣. گۆڤارەکەم بەپاڵ کەوتنەوە خوێندنەوە.

# ئــــەدەب

١. ڕێبازە ئەدەبییەکان :
ڕێبازی ڕۆمانتیکی ( بەگشتی )
٢. ئەدەبیاتی کوردی سۆڤیەتی جاران.
٣. پەخشانی کوردی ( جۆرەکانی )
٤. کوردی پەتی

**نموونەی ئەدەب :**

١. سەی یاقۆبی ماهیدەشتی
٢. عەلی حەریری
٣. مەحوی
٤. شێخ ڕەزا.
٥. ناری
٦. زێوەر
٧. شێرکۆ بێکەس
٨. شێخ غەیاسەدین نەقشەبەندی
٩. شێخ محەمەدی خاڵ
١٠. ڕەوشەن بەدرخان.

# ڕێبازە ئەدەبییەکان

## ڕێبازی ڕۆمانتیکی

کە یەکەم جار وشەی ڕۆمانتیك دەبیسین یەکسەر شتی خودیو خەیاڵیو سۆزو شەیدابوونی سروشتو خۆشەویستی ئاسەواری کۆنمان بە بیردادێ.

ڕێبازی ڕۆمانتیك لە ئەورووپا نزیکەی سەدەو نیوێك دوای دەرکەوتنی ڕێبازی کلاسیزم سەری هەڵدا، ئەم ڕێبازە تازەیە شۆڕشێك بوو دژی هەموو دەستوورو بنەما دەقگرتووەکانی ڕێبازی کلاسیزم، شۆڕشێك بوو بۆ ڕزگارکردنی ئەدەبو هونەر لەژێر دەسەڵاتی داسەپاوی ئەدەبیاتی گریکیو لاتینی کۆن.

ڕێبازی ڕۆمانتیك: ئازادکردنی حەزو ئارەزوو وروەهاکردنی سۆزو مەگێزەکانی مرۆڤە، جڵەو بەردانی فریشتەی ئەدەبو هونەرە، کردنەوەی جیهانی بێ سنوورە بۆ پەروازەبوونی سۆزو گیان.

وشەی ڕۆمانتیك لە وشەی (ڕۆمانیوس– Romanius)ەوە هاتووە کە بەو زمانانە دەگوترا کە لەلاتینی کەوتبوونەوەو لە سەدەکانی ناوەڕاست بەزاری ڕەمەکی (عام) دادەنران و لەسەرەتای چاخی ژیانەوەدا (ڕێنیسانس) وردە وردە بوون بە زمانی نووسینو جێگای زمانی لاتینیان گرتەوە، ڕۆمانتیکیەکان کە ئەم وشەیان بۆ ڕێبازەکەیان دانا مەبەستیان ئەوەبوو مێژوو، ئەدەبو کولتووری نەتەوایەتی خۆیان لەوانەی گریك

(١) ڕێبازی کلاسیك لە پۆلی دەیەم خوێندراوە

ولاتینی جودا بکەنەوە کە بەسەر کلاسیزمدا زاڵ ببوو. یان وشەکە لە (Romance)ەوە هاتووە کە لەسەدەکانی ناوەڕاست بە چیرۆکی خەیاڵیو پاشان سوارچاکی دەگوترا کە بە شیعر بوویێ یان بە پەخشان. ڕۆمانس پەیوەندی بە ئۆرستوکراتەکانەوە هەبوو بەڵام زمانەکەی سادەو ساکاربوو، زمانی میللەت بوو ڕۆمانس دواتر دوو لقی لێ جودا بووەوە– ڕۆمانسی ئورستوکراتیو رۆمانسی میللی.

## سەردەمی دەرکەوتنی ڕێبازی ڕۆمانتیکی :

ڕێبازی ڕۆمانتیك لە ئەوروپا دەرکەوتووە بەڵام لە هەموو وڵاتانی ئەوروپا بەیەك كات نەبووە. یەکەم جار (فردریك شلیگل)ی ئەڵمانی ڕۆمانتیکی وەکو ڕێبازێکی ئەدەبی دژی کلاسیزم پەیڕەو کرد، (مادام دو ستایل) لەژێر کاریگەری ئەوەوە لە فەڕەنسا بانگەشەی بۆدا. لە فەڕەنسادا کە مەڵبەندی چەسپانو بڵاوبوونەوەی ڕێبازەکەیە، ساڵی ۱۸۰۰– ۱۸۳۰ بەماوەی خۆگرتنو پەرەسەندنی ئەو ڕێبازە دادەندرێ. (فکتۆر هۆگۆ) دەوری سەرەکی لە چەسپاندنی ڕێبازی ڕۆمانتیك هەبووە، ساڵی ۱۹۲۷ شانۆگەری (کرۆمۆیل)ی بڵاوکردەوە، لە پێشەکیدا باسی گەشەسەندنی شیعر دەکا لە مێژووی مرۆڤایەتیو دەیکا بە شیعری لیریکیو شیعری ئیپیکیو شیعری دراماتیکی، ئەم پێشەکییە وەکو بەیاننامەو ئینجیلیی ڕۆمانتیکی وابوو.

## خاسیەتەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیکی:

لەبەر ئەوەی ڕۆمانتیك کاردانەوە بوو دژی دەستوورەکانی کلاسیزم، ئەگەر خاسیەتەکانی کلاسیزم هەڵبگێڕینەوە، خاسیەتەکانی ڕۆمانتیکمان دەکەوێتە دەست کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١. ڕۆمانتیك دەسەڵاتی (عەقڵ) بەلاوە دەنێ، بایەخ بە ئازادکردنی هەستو سۆز دەدا، لەباتی مێشك، دڵ دەکا بە کانگای ئیلهامو شوێنی شعورو ویژدان.

٢. ڕۆمانتیك گەڕانەوەیە بۆ باوەشی سروشتی کپو هێمن. شاعیر بە سروشت هەڵدەڵێو حەز دەکا، بە گۆشەگیری، تێکەڵ سروشت ببێو لە باوەشی سروشتدا بکەوێتە ڕامانو جڵەوی ئەندێشەی بەربداو بەدوای جوانیدا بگەڕێ، شاعیر جوانی لەهەموو دیمەنێکی سروشتدا دەبینێو بە نەمانی بچووکترین دیمەنی دڵی دادەخورپێو ئازار دەچێژێو فرمێسك دەڕێژی، وەکو: هەڵوەرینی خونچە گوڵێكو ئاوابوونی ڕۆژو بزربوونی ئەستێرە.

٣. ڕۆمانتیك باوەڕی بە ئازادی هەیە لە دەربڕینی هەستو سۆزو جۆشی ناوەو گوێ بەهیچ دەستوورو قاڵبێکی چەسپاو نادا. ڕۆمانتیك هەر لەبنچینەدا خۆی شۆڕشو ئازادییە، جڵەو بەردانە بۆ ئەو ئەندێشەی کە هیچ سنوورێك نازانێ.

٤. ڕۆمانتیك بایەخ بە تاك (من)ی شاعیرو تاقیکردنەوەی تایبەتی دەدا، ئەم خودی و تاکیەتییە لە خۆشەویستییەکی قووڵی تا ڕادەی شەیدابوون خۆی دەنوێنێ. خۆشەویستی ڕۆمانتیك سیمایەکی

پاکیزەی هەیە، وەکو لە دونیای فریشتەدا بێ وایە. ئەم تاکیەتی‌و سرکیی‌و ناسکییە دەبێ بە حاڵەتێکی دەروونی وا خاوەنەکەی هەست بە بێزاری‌و خەم‌و پەژارە دەکا... گوزارشت دانەوە لە جۆشی ناوەوە پەردەیەکی خەمی بەسەردا دەکشێ. شاعیر وا هەست دەکا کە خۆی چەقی هەموو دونیایە زۆرجار تووشی نیگەرانی‌و هەڵچوون دەبێ.

٥. ڕۆمانتیك لە بایەخدانی بە کات‌و شوێندا، تووشی نامۆیی دەبێ، لەگەڵ سەردەم‌و شوێنی خۆی ناگونجێ، بە خەیاڵ بەرەو ڕابردوو دەگەڕێتەوەو خەم بۆ ساتە خۆشە ڕابردووەکان دەخوا، و بۆ ڕزگاربوونیش لە ئاژاوەی شار کە شوێنی خۆیەتی بەرەو سروشت ڕادەکات.

٦. ڕۆمانتیك‌و نەخۆشی سەردەم. ڕۆمانتیکیەکان هیواو ئاواتیان زۆر بوو بەڵام توانای هێنانەدی ئەو ئاواتانەیان نەبوو، ناکۆکی نێوان ئاواتی زۆرو توانای کەم، بوو بەهۆی نا ئومێدی‌و ڕەشبینی، ئەمەش بەرەو وەڕس بوونی دەبردن لەژیان‌و گازاندەیان لە بەختی خۆیان‌و جەوری زەمانە دەکردو ئازاریان بە دەستەوە دەچەشت مرۆڤ تەنیا بە دوو هۆ دەتوانێ لەم ئازارە ڕزگاری ببێ:

- یان سروشتی خۆی بگۆڕێ‌و دەست لە ئاوات‌و ئارەزووەکانی بەربدا.
- یان سروشتی دەرەوە بگۆڕێ‌و وای لێ بکا ئاوات‌و ئارەزووەکانی پێ بێتەدی.

٧. مۆركی ناوچەیی: ڕۆمانتیك كە باسی مرۆڤ دەكا وەكو شتێكی گشتی باسی ناكا كە باسی هەستو سۆز دەكا وەكو هەستو سۆزێكی گشتی باسی ناكا، بەڵكو هەر مرۆڤێكو هەر هەستو سۆزێك مۆركی تایبەتی خۆی وەردەگرێ بەپێی ئەو شوێنەی مرۆڤەكەی تێدا ژیاوەو ئەو مرۆڤەی هەستو سۆزەكەی لەلا پەیدا بووە. مرۆڤی ئەسپانی جیایە لە مرۆڤی یۆنانی، مرۆڤی یۆنانی جیایە لەمرۆڤی ئەڵمانی.

٨. ئەندێشەی داهێنەرانە. لای ڕۆمانتیكیەكان ئەدەب بەگشتیو شیعر بەتایبەتی لاساكردنەوەی سروشتو ژیانە، بگرە داهێنانە (خەلقە). ئامرازی خەلقیش لای ڕۆمانتیكیەكان ئەندێشەی داهێنەرانەیە. ئەو ئەندێشەیەیە كە ڕەگەزە پەرتەكانی سروشت یان واقیع یان یا دەوری ڕابردوو یان پێشبینی ئایندە بە یەكەوە گرێ دەدا. لەم جۆرە ئەندێشەیەدا، ڕوانینی شیعری قووڵو ڕوونو بەجۆش دەبێو گیانی شاعیر دەهەژێنێو دەبێ بەتاقیكردنەوەی شیعریی بۆ شاعیرەكە.

٩. بابەتی ئەدەبی ڕۆمانتیك. ڕۆمانتیكی ئەوروپی بابەتەكانی تەقلیدی نین، دەتوانێ هەر شتێ بكاتە بابەتی نووسین، وەكو دیمەنەكانی سروشت، مێژووی نەتەوایەتی، مۆركی ناوچەیی، شتی تایبەتی لەباتی گشتی، فەلسەفەی میسالی، ڕەگەزی لە ئاسایی بەدەر، كەلاوە، شەو، مردن، گۆڕ، خەون،...

١٠. چۆنیەتی دەربڕینی ڕۆمانتیك لە دەربڕیندا پەنا دەباتە بەر هەندێ سیمای تایبەتی وەکو: ڕزگاربوون لە دەستوورو یاسا، ئالۆزی، تێکەڵ کردنی هەستەکان، بەناویەکدا چوونی ئەرکی هونەرە جوانەکان، ڕەچاوکردنی لایەنی زاتیو لیریکی،...

## ڕۆمانتیك لە ئەدەبی کوردیدا:

ڕۆمانتیك لە ئەدەبی کوردیدا، لە شیعر زیاتر دەردەکەوێ تا لە جۆرەکانی دیکەی ئەدەب. هەر چەندە ڕەگەزی ڕۆمانتیك بۆ سەدەی نۆزدە دەگەڕێتەوە وەك لەهەندێ شیعری حاجیو لە شیعرەکانی مەولەویدا هاتووە، بەلآم بەشێوەیەکی زەق ئەو ڕەگەزانە لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم گەڵاڵە بوون، بەتایبەتی لەماوەی نێوان هەر دوو جەنگی گێتی. ئەمەش جگە لە کاریگەری ناوەوە، کاریگەری دەرەوەشی بەسەرەوە هەبوو. شیعری نەتەوە دراوسێکانو بەتایبەتی شیعری تورکی لەو سەردەمەدا کاری زۆری کردبووە سەر ئەو جولانەوە تازەگەرییەی لە گەڵاڵەبووندا بوو، جگە لەکاریگەری شیعری ئەورووپی کە چ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بێ لەڕێی شیعری تورکییەوەو چ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێ کاری زۆری کردبووە سەر گوڕپێدانی جووڵانەوەی تازەگەریی شیعری کوردی هەر چەندە بزاڤی پێشکەوتنخوازی تورکی لەسەدەی ڕابردوودا بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی بەخۆیەوە نەگرت لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆشنبیرانی کورد زۆر سوودیان لە ئەدەبی پێشکەوتنخوازی تورکی وەرگرتو گۆڕانێکی

بنجییـان لەشـێوەو نـاوەڕۆکی شـیعری کـوردی هێنایـە کایـەوە کـە لەڕاسـتیدا شـۆڕش بـوو دژی دەسـتوورو بنـەماکانی ڕێبـازی کلاسـیزم. پێشەنگانی ئەم نوێخوازییـە بریتـی بوون لـە شـێخ نـووری شـێخ سـاڵحو ڕەشید نەجیبو گۆرانو پیرەمێردو... کە هـەموویان کاریگـەری شـیعری ئەوروپیو تورکییان زەق پێوە دیار بوو.

## بنەماکانی ڕۆمانتیك لە شیعری کوردیدا:

١. پشت کردنـە کێشی عـەرووزی کـە شـیعری کلاسـیزمی کـوردی پـێ نووسـراوەو گەڕانـەوە بـۆ کێـشی ژمـارەیی (بڕگـەیی- پەنجـەیی- خۆماڵی ) کە کێشێکی ڕەسەنی کوردییـەو لەسـەر بنـەمای ژمـارەی بڕگەی لەتە دێڕ هاتووەو هەموو شـیعری فۆلکلـۆریو زۆربـەی هـەرە زۆری شیعری زاری گۆرانو لوڕ بەو کێشە نووسراوە.

٢. وازهێنان لە یـەکێتی سـەرواو بـەکارهێنانی سـەروای مەسـنەوی یـان سەروای ڕەنگاوڕەنگ کە شاعیر بەپێی پێویست پـەنای دەباتـە بـەر بـۆ ئـەوەی لـەپاڵ کێـشە ڕەسـەنەکە ئـاوازێکی تایبـەتی بـە هۆنراوەکەیدا.

٣. یەکێتی بابەت لە شـیعری ڕۆمانتیکیـدا بەسـەر هـەموو هۆنراوەکـەدا دابـەش دەبـێ. هـەموو دێڕەکـان یـەکێتی پتـەویان لـەنێو دایـەو پەیوەندییـەکی واتـاییو ئـەدەبی پتـەو بەیەکـەوە دەیانبەسـتێتەوە لابردنی هەر دێڕێكو زیاتر کردنی هەر دێڕێك هۆنراوەکە دەشێوێنێ.

٤. بەکارهێنانی زمانێکی سادەو ئاسان کە هەموو کەس تێی بگا، نەك کۆمەڵێکی دەستەبژێر (نخبە)، وشەکانی هەموو کوردی پەتین‌و بەپێی توانا شاعیر خۆی لەبەکارهێنانی وشەی عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی قورس دوور دەخاتەوە. واتە وشەو دەستەواژەو ڕستەکان کورت‌و پەتی‌و پوخت‌و ڕەسەن‌و بێ گرێ‌و گۆڵن‌و مانایان ئاشکراو دیارە.

٥. شاعیر بەپێی توانا خۆی لە هونەرە ڕەوانبێژییە تەقلیدییەکان لادەداو بەدوای لێکچواندن‌و خوازەو هونەری جوانکاری تازەدا دەگەڕێ.

٦. شاعیر جگە لەوەی کە بەزمانێکی سادەو ئاسان دەنووسێ کە هەموو کەس تێی بگا، نووسینەکەشی بۆ هەموو کەسەو لەپێناوی ڕەشەوەندی خەڵکەکە دەنووسێ‌و نووسینەکەی خزمەتی چینە زۆر لێکراوو قوربانییەکانی کۆمەڵ دەکا.

٧. گەڕانەوە بۆ سروشت‌و گەڕان بەدوای جوانی لە دیمەنەکانی سروشت‌و خەم خواردن بۆ دیمەنە جەرگبڕەکان وەکو وەرینی گەڵای دارێك‌و خشینی ئەستێرەیەك‌و ئاوابوونێکی مانگ‌و خۆر...

٨. خۆشەویستییەکی پاك‌و بێگەردو زۆرجار نا ئومێد بوون لە خۆشەویستی‌و ڕوانینە ژیان‌و دوا ڕۆژ بەچاوی ڕەشبینانەو پەسەندکردنی گۆشەگیری‌و خۆدوور خستنەوە لە خەڵك.

٩. تاکێتی (زاتییەت)و باس کردنی دەردو ئازاری تایبەتی‌و خۆ دوورخستنەوە لە بابەت‌و هەست‌و سۆزی گشتی‌و عەودالّ بوون

بەدوا ئەو دیاردانەی کار لەدەروونی دەکەن، خۆشی پێ دەبەخشن یان ئازاری دەدەن‌و لە ئەنجامدا تووشی گەشبینی یان ڕەشبینی دەکەن.

١٠. ڕابردوو دەبێتە مەیدانێکی فراوان، ئەندێشەی شاعیر دەگەڕێتەوە سەری‌و بابەتی ئەدەبی‌و دیمەنی گەش‌و جوانی لێ وەردەگرێ‌و دووبارە دروستی دەکاتەوەو زۆرجار بەسەر چرکەساتێکی خۆشی بەسەرچووی ڕابردوودا دەگرێ چونکە دەزانێ ئەو خۆشییە تازە ڕۆیشت‌و ناگەڕێتەوە.

١١. سوود وەرگرتن لە کەلەپووری میللی بە هەموو کەرەستەی زمان‌و بابەتی ئەدەبییەوە بۆ نووسینی بەرهەمی وا کە گیانی میللی‌و نەتەوایەتی‌و نیشتمانی تێدا بدرەوشێتەوە.

## ڕۆمانتیک لە
## ئەدەبیاتی کوردی- شێوەی کرمانجی خواروو

لەشێوەی کرمانجی خوارووداً، سەرەتای تازەکردنەوەی شیعری کوردی‌و شکاندنی کۆت‌و یاساکانی کلاسیزم لە بیستەکانی سەدەی بیستەم دەستی پێ کردو یەکێ لەڕابەرانی ئەو تازەکردنەوەیە (گۆران)ی شاعیر بوو. کە لێرەدا کورتەی ژیان‌و نموونەیەکی شیعری سەر بەڕێبازی ڕۆمانتیکی دەنووسین‌و شی دەکەینەوە...

# گۆران ١٩٠٤- ١٩٦٢/١١/١٨

گۆران ناوی عەبدوللایەو کوڕی سلێمان بەگی کاتبی فارسییە. لە ساڵی ١٩٠٤ی زاییندا لە شارۆچکەی هەڵەبجە هاتۆتە دنیاوە بە منداڵی لای باوکی خوێندوویەتی پاشان چۆتە قوتابخانەی سەرەتاییو دوو ساڵیش لە قوتابخانەی ناوەندی کەرکووك خوێندوویەتیو بەهۆی مردنی باوکیو کوژرانی محەمەد بەگی برای وازی لە خوێندن هێناوەو گەڕاوەتەوە هەڵەبجە. ماوەیەك مامۆستای سەرەتایی بوو. لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانی بەڕێوەبەری بەشی کوردی بوو لە ئێستگەی (ڕۆژهەڵاتی نزیك- الشرق الادنی) لە یافا، فەلەستین. کە جەنگ بڕایەوە، گەڕایەوە سلێمانی. دوای شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨و دامەزرانی بەشی زمانی کوردی لە زانکۆی بەغدا، بوو بە مامۆستای وانەبێژو ئەدەبو ڕەخنەی ئەدەبی گوتۆتەوە. لەژیانیدا زۆر تووشی ئەشکەنجەو گرتن بووەو تا لە ١٩٦٢/١١/١٨ کۆچی دوایی کرد.

## بەرهەمەکانی:

١. فرمێسكو هونەر.
٢. بەهەشتو یادگار.
٣. سروشتو دەروون.
٤. لاوكو پەیام.
٥. هەڵبژاردە (وەرگێڕانی کۆمەڵە چیرۆکێکی بیانییە).
٦. جگە لە دەیان وتارو شیعری وەرگێردراو و موحازەرەکانی کۆلێجی ئادابی بەغدا.

نموونەی شیعری

# پـــایـز

پایز! پایز!

بووکی پرچ زەرد،

من مات، تۆ زیز:

هەردوو هاودەرد!

من فرمێسکم، تۆ بارانت.

من هەناسەم، تۆ بای ساردت.

من خەم، تۆ هەوری گریانت.

دوایی نایە: دادم دادت

هەرگیز، هەرگیز،

پایز! پایز!

***

پایز! پایز!

شانو مل ڕووت،

من مات، تۆ زیز،

هەردووکمان جووت،

هەر چەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین،

ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگرین،

پۆلی باڵدار ئەفڕێ بگرین،

بگرین.. بگرین..چاومان نەسڕین،

هەرگیز، هەرگیز!

پایز! پایز!

* * *

(کۆپلەی یەکەم بۆ لەبەر کردنە)

گۆران لەم هۆنراوەیەدا، دەگاتە ئەوپەڕی ڕۆمانتیکیەت، سۆزێکی خەستو قووڵ بە سروشتی دەبەستێتەوە لە خەمناکترین وەرزی ساڵدا کەپایزەو شاعیر بە جۆرێکی وا لەگەڵ سروشتو پایزدا تێکەڵ دەبێ کە هەردووکیان دەبن بەیەکو هیچ سنوورێك لەنێوانیان نامێنێ.

گۆران بۆیە پایزی هەڵبژاردووە لەو وەرزەوە چۆتە باوەشی سروشت چونکە مەرگی (جوانیی) تێدا دەبینی، جوانییش لای گۆران هەموو شتێکەو نەمانی جوانیی زۆر ئازاری دەداو دەیخاتە دونیایەکی پڕ ژانو ئازارەوە... نەمانی گەڵای درەخت، سیس بوونی گوڵ، کۆچو ڕەوکردنی پۆلی باڵدار...

لەم هۆنراویەدا، گۆران پایز وەکو خۆی دەبینێ، هەردووکیان (هاوەدرد)ن. ئەم هاوکێشەیە ئەو کاتە بەرەو تەواوی دەچێ کە گۆران بەراوردەکە فراوانتر دەکا، دیاردەی خەمو ئازاری خۆیو هی سروشت بەرامبەر یەکتر ڕادەگرێ:

فرمێسك = باران

هەناسە = بای سارد

خەم = هەوری گریان

ئەم دیاردانە لە ڕوانگەی گۆرانەوە بەردەوامنو هەرگیز دادی خۆیو سروشت لەدەست ئەم نەهامەتیانە کۆتایی نایە، بۆیە ئەمەش بەرەو نا ئومێدی ڕۆمانتکیانەی دەباتو داوا دەکا لەگەڵ پایز هەربگرینو چاویان نەسڕن.

ئەم هۆنراوەیە لەسەر بنەمای دوو لایەنی دامەزراوە: شاعیرو سروشت (پایز) شاعیر هاوکێشەیەك دروست دەکا لەنێوان خۆیی (الذات) و پایز (الموضوع)و هەردووکیان بەیەکەوە هەڵدەچنیو تێکەڵ بەیەك دەبن‌و بەیەکەوەش بەرەو کۆتایی دەچن کە نا ئومێدییە.

## گرنگترین ڕەگەزەکانی ڕۆمانتیکی لەم هۆنراوەیەدا ئەمانەن:

١. گەڕانەوە بۆ سروشت‌و تێکەڵ بوونی گیانی بەگیانی لەگەڵ دیاردە خەمناکەکانی، کە سۆزێکی قووڵ لەدڵی شاعیردا دەبزوێنن‌و هاودەردییەك لەنێوانیان دروست دەکەن.

٢. خەم‌و ئازار خواردن بۆ نەمانی جوانیی، کە لەم هۆنراوەیەدا لە سیس بوونی گوڵ‌و وەرینی گەڵای درەخت‌و فڕینی باڵداردا دەردەکەوێ‌و هەموویان نیشانەی مردنن، مردنیش یەکێکە لەو بابەتانەی ڕۆمانتیك خۆیان پێوە خەریك دەکا.

٣. خەیاڵێکی ڕۆمانتیکیانەی فراوانی تێدایە بۆتە مایەی دروست کردنی زۆر وێنەی هونەری جوان، وەکو (بووکی پرچ زەرد)و (شان‌و مل ڕووت) بۆ پایزو (ڕژانی ئاڵتونی دار)...

٤. هۆنراوەکە لەسەر کێشی برگەیی (پەنجەیی– خۆماڵی) نووسراوەو کێشی ئازادە، چونکە شاعیر پێی چوار برگەیی کردووە بە بنەماو لەهەر لەتێکدا یەك پێی یان دوو پێی هێناوە، واتە (٤)یان (٨) برگەیە.

٥. لەبارەی سەرواوە، گۆران سێ چوارینەی پێشەوەی بە سەروای (بەنۆرە- متناوب) هێناوە کە بەم جۆرە دارژاوە (أ ب أ ب)، چوارینەی کۆتاییشی هەموو لەتەکانی لەسەریەك سەروا دەڕوا ئەمەش پێی دەگوترێ (چوارینەی تەواو) واتە گۆران خۆی بە یەکێتی سەروا نەبەستۆتەوە.

٦. وشەکانی هەمووی کوردین‌و خۆی لە وشەی بیانی نەداوە، سەراپای هۆنراوەکە، ڕەنگە یەك تاکە وشەی تورکی تێدابێ ئەویش (ئالتون)ە...

٧. دووبارەکردنەوەی هەندێ وشەی تایبەتی وەکو (پایز) کە کرۆکی هۆنراوەکەیە بابەتەکەی قوڵتر کردۆتەوە، جگە لەو ئاوازە ناسکەی لە دەنگی وشەکانەوە پەیدا دەبێ‌و هۆنراوەکە پڕ ئیقاعی خەمناك دەکا.

## ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکی کوردی- شێوەی گۆران

لە ئەدەبیاتی زاری گۆرانیشدا هەر شیعر بەسەر جۆرە ئەدەبییەکانی دیدا زاڵە. شیعری شێوەی گۆران هەر لەسەرەتاوە ڕێچکەی تایبەتی خۆی گرتووەو خاوەنی خاسیەت‌و سیمای تایبەتی خۆی بووە کە لەزۆر لاوە لەشیعری شێوەکانی دیی کوردی جودایە. یەکێ لە سیما هەرە دیارەکانی شیعری ئەو شێوەیە ئەوەیە کە، بە دەگمەن نەبێ، نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری کێشی عەرووزی‌و یەکێتی سەروای غەزەلی عەرەبی، فارسی وەکو شێوەکانی دی... زۆر شاعیری بە توانا لەو

شێوەی زمانی کوردی هەڵکەوتوونو مەولەوی یەکێکە لە شاعیرە هەرە بەرزەکانیان. شیعرەکانی مەولەوی پڕن لە سۆزی خۆیەتی (زاتییەت)و خەمو جەخارو باسی مەرگو مردنو وەسفی سروشتو هەستی سۆفیزمانەی قووڵو سووتان بە دەردی دووریی‌و بێزاریی لە ژیانو خۆزگە خواستن بە مردن... ئەمانەش ڕەگەزە سەرەکییەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیکن، بۆیە هەرچەندە لەسەردەمی مەولەویدا، کە سەدەی نۆزدەمینە، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە کوردیدا پەیدا نەببوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین زۆربەی شیعرەکانی مەولەوی بە ڕۆمانتیکیەت دابنێین هەر بۆیەش لێرەدا نموونەیەکی شیعری مەولەوی بۆ ئەو ڕێبازە وەردەگرینو شی دەکەینەوە.

# مەولـەوی

مەولـەوی نـاوی (عەبـدوڕەحیم)ی کـوڕی (مـەلا سـەعید)ەو نازنـاوی (مەعـدووم)ەو بـە (مەولـەوی) ناوبـانگی دەرکـردووە، بـە شـەش پـشت دەگاتەوە مەلا ئەبووبەکری مەسەننیف، خاوەنی کتێبی (الوضـوح) و لـە بنەماڵەی پیر خدری شاهۆیە. لەساڵی ١٨٠٦ لە گوندی (یاقشلاخ)ی سـەر شـاتەی ناوچـەی تـاوە گـۆز هاتۆتـە دونیـاوە. سـەرەتا لای بـاوکی خوێندوویەتی، پاشان بۆ خوێنـدن (مـەریوانو چـوڕو نەنـەو سـنەو بانـەو سلێمانیو هەڵەبجە) گەڕاوە. بۆ جاری دووەم دەچێتە سنەو لە مزگەوتی (دار الاحسان) لای حاجی مەلا ئەحمەدی نۆتشی دەخوێنێو ساڵی ١٨٤١ ئیجـازەی مەلایـەتی لێ وەردەگـرێو دەگەڕێتـەوە وڵاتـی خـۆی. پاشـان دەکەوێتـە داوی شـێخ وەسمـانی تەوێڵـەو تەریقـەتی لێ وەردەگـرێ. لـە (چۆرەو بێژاوەو بیاوێـڵ)و ئینجـا سەرشـاتەی پـشت قـەڵای (شمێـران)ی سەر سیروان دەرز دەڵێتەوە. لە ساڵی ١٨٨٢ هـەر لەسـەر شـاتە کۆچـی دوایی کردووەو گۆڕەکەی بۆتە مەزارگای شەیدایانی خۆیو شیعرەکانی.

### گرنگترین بەرهەمی مەولەوی ئەمانەن:

١. الفضیلة، ٢٠٣١ دێڕە شیعری عەرەبییە.
٢. العقیدة المرضیة، ٢٤٥٢ دێڕە شیعری کوردییە.
٣. الفوائح، ٥٢٧ دێڕە شیعری فارسییە.
٤. دیوانی مەولەوی، کە شیعرەکانی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

نموونەیەك

١. ئێمشەو هەم دیسان دەروون پڕ خەمەن
ئەساسەی ماتەم جەلامان جەمەن

٢. نەتاوی دووری دڵ بێ قەرارەن
بینایی دیدەم جە خەفەت تارەن

٣. شریخەو گرمەی هەور دووریی دۆس
وەفەنا بەردەن مەغزو ڕەگو پۆس

٤. شەرارەی گرپەی ناری مەهجووری
کەردەن وەغوبار کۆگای سەبووری

٥. نەتاقەت مەندەن نەتۆی دەروونـدا
نە لەیلی مەدیۆ وەلای مەجنووندا

٦. یاخوا مەردەنی بۆ وە میهمانم
ئیتر نەوینوون دووریی یارانم

٧. بەڵکم خەلاسیم نەدەس دووریم بۆ
بەو زووخی زامان نەشوون وەگڵکۆ

(لە سەرەتاوە سێ دێڕ بۆ لەبەرکردنە)

## لێکدانەوەی وشەکان:

ئەساسە : بنچینە، هۆ، ئەگەر.

ماتەم : شین، تازیە، بەهی.

جە : لە، جەلامان: لە لامان.

جەم : کۆ، گرد، جەمەن: کۆبوونەتەوە، گردبوونەتەوە.

نە : لە، نەتاو دووری: لەتاوی دووری.

بێ قەراو : بێ ئۆقرە، بێ هەدادان.

دیدە : چاو.

تار : تاریک.

دۆس : دۆست، برادەر.

فەنا : لەناوچوون، نەمان.

مەغز : مێشک، مژی.

ڕەگ : دەماری لەش، ڕەه.

پۆس : پێستە.

شەرارە : پرووشک، پزیسک.

گرپە : گڵپە، کرفە.

نار : ئاگر.

مەهجووری : دووری، لێک دابڕان.

کەردەن : کردوویە.

مەندەن : ماوە.

| | | |
|---|---|---|
| تۆی | : | تۆێی، ناوەوەی، پەردەی. |
| مدێو | : | دەڕوانیٚ، بەریٚ خۆ ددەتیٚ. |
| وە | : | بە، وەلای = بەلای |
| مەردەنی | : | مردن. |
| بۆ | : | ببیٚ. |
| میهمان | : | میوان، میڤان. |
| نەوینون | : | نەبینم. |
| زووخ | : | زووخاو، کێم. |
| زامان | : | برینان، زام = برین |
| نەشوون | : | نەچم. |
| گڵکۆ | : | گۆڕ، قەبر. |

مەولەوی باسی خەمو خەفەتی دڵی خۆی دەکا لە شەوێکدا، چۆن بەو شەوە بەدەم خەمەوە دەتلێتەوە ولێلایی چاوی داهاتووە لەبەر گریانو لەبەر دووری دۆستەکەی مێشكو گیانی لێك هەڵوەشاوەو سەبرو قەراری لەبەر بڕاوە... تووشی نا ئومێدی هاتووە، چونکە نەخۆی تاقەتی ماوەو نە یاریش ئاوڕێکی لیٚ دەداتەوە، ئیتر لەو نا ئومێدییەدا خۆزگە بە مردن دەخوازیٚ بۆ ئەوەی لە دەست دەردی یار بحەسێتەوەو بەو زامە سەختەوە نەچێتە ژێر گل.

## گرنگترین ڕەگەزی ڕۆمانتیکی لەم شیعرەدا ئەمانەن:

١. شاعیر شەوی هەڵبژاردووە، باسی خەفەتی خۆی لەو شەوە دەکا... شاعیرانی ڕۆمانتیك زۆرجار پەنا دەبەنە بەر شەو، کە دونیا کپ و بێ دەنگ دەبێ و هێمنی باڵ بەسەر دونیادا دەکێشێ، لەو ساتە کپ و هێمنەدا دەکشێنەوە ناو دونیای تایبەتی و ناوەوەی خۆیان و بیر لە ڕابردووی خۆشی تێپەڕبوو و ئایندەی خەیاڵاوی دەکەنەوە...

٢. شاعیر باسی دوورکەوتنەوەی دەکات و کاریگەری ئەو دوورییە لەسەر هەست و هۆش و مێشك و دەمارەکانی پیشان دەدا، چونکە دوورکەوتنەوە لەخۆشەویست یەکێکە لەهۆیە سەرەکییەکانی بەدبەختی عاشق... ئەو دوورکەوتنەوە شاعیر دەخاتە ئازار و خەیاڵات و وای لێ دەکا بیر لە ساتە خۆشەکانی ڕابردوو بکاتەوە و بەراوردێك بکا لەنێوان ئەوسا، کە لەگەڵ یارەکەی خەفەتی بەبا دەدا، و ئێستا، کە بەدەست ئازاری دووری یارەوە دەتلێتەوە.

٣. لەم بارە دوورنییە سەختەی شاعیر تێیدا دەژی لە ئەنجامی دووری یارەکەی، تووشی سەرگەردانی و نا ئومێدی دەبێ. هیوای بەدیداری دۆس نامێنێ و ژیانیش بۆ دۆس مانای تێدا نامێنێ، چونکە دۆس و ژیان لای شاعیر دەبن بەیەك، ئیدی ئەو نائومێدییە دەگاتە ئەو پەڕی و شاعیر خۆزگە بەمردن دەخوازێ...

٤. مەولەوی وەکو هەموو شاعیرانی شێوەی گۆران، پەیڕەوی کێشی برگەیی (پەنجەیی– خۆماڵی) کردووە و هەموو شیعرەکانی لەسەر کێشی (١٠= ٥+٥ ) برگە نووسیوە. ئەمەش کێشێکی زۆر باوی

کوردییـەو تەنانـەت گـۆرانی شـاعیر ئەمـەی بەکێشی نەتـەوەیی داناوە...

٥. لـەڕووی سـەرواوە، یـەکێتی سـەروای پـەیڕەو نـەکردووە، سـەروای مەسنەوی بەکارهێناوە. ئەم سەروا مەسنەوییە بوار زێتر بۆ شاعیر دەرەخسێنێ کە درێژە بە دەربڕینی هەستی ناوەوەی بداتو وشەی باشترو لەبارتر هەڵبژێرێ.

٦. وشەکانی بەکاری هێناون زۆربەیان وشەی ڕەسەنی کوردین، ئەگـەر وشەی بیانیشی بـەکارهێنابێ، ئەوانـەی بـەکارهێناوە کـە زۆربـاونو هەموو کەس تێیان دەگا.

٧. وێنەو لێکچواندنو خوازەکانی زۆر باونو هەموو کەس تێیـان دەگـا، بەدوای دارشتنی ئاڵۆزو دوورە دەست نەگەڕاوە، هـەر دەڵێـی لـەناو دۆستان دانیشتووەو باسی ئازارو مەینەتی خۆیانی بۆ دەکا.

## ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکی کوردی- شێوەی کرمانجی ژووروو

لەشـێوەی کرمـانجی ژوورووش، وەکـو شـێوەی کرمـانجی خـواروو، شیعری کوردی لەنێوان هەردوو جەنگی گێتی سەدەی ڕابردوودا گـۆڕانی بنـچینەیی بەخۆیـەوە دیو سـیماو خاسـیەتی نـوێی وەرگـرت. ئـەم نوێکردنەوەیەی شیعری شێوەی کرمانجی ژووروو بەشـێوەیەکی دیـار لـە سـییەکانی سـەدەی ڕابـردوودا گەڵاڵـەبوو، بەتایبـەتی لـەگۆڤاری هـاوارو ڕوناهیو ستێر، کە مینبەری بڵاوکردنـەوەی شـیعری نـوێی ئـەو شـێوەیە بـوون. زۆر شـاعیری کرمـانجی ژووروو دەوریـان لـەو تـازە کردنەوەیـەدا

هەبوو وەکو قەدری جانو کامەران بەدرخانو جگەرخوێنو... کە وازیان لە دەستوورەکانی شیعری کلاسیزم هێناوە بەشێوازێکی نوێوە بابەتی تازەیان هێنایە کایەوە... شیعری خودی لیریکی– و شۆڕشگێڕی، لەو سەردەمەدا برەویان سەند، چونکە ڕەنگدانەوەی ڕاستەقینەی بارودۆخی ئەوسای نەتەوەیی کوردو کوردستان بوون... شۆڕشە ڕزگاریخوازەکانی کوردو ئەو نسکۆیانەی تووشی کورد بوون، دەوری سەرەکییان هەبوو لەسەر هەستو سۆزی شاعیرانو زۆریان لە ئەنجامی تێکشکانی ئەو شۆڕشانە تووشی گۆشەگیریی و نا ئومێدیی بوونو زۆریشیان بەچاو ڕوونییەو دەیانڕوانییە دوا ڕۆژو بڕوایان بە سەرکەوتن هەبوو، ئەمانە هەمووی لە شیعری ئەو کاتەوە دیارە... یەکێ لەو شاعیرانەی هەر لەسەرەتاوە بەچاوێکی تازەوە دەیڕوانییە ژیانو دەورووبەرو ڕەخنەی لە کەمو کورتییەکانی کۆمەڵی دواکەوتووی کورد دەگرتو بەشەهیدەکانی شۆڕشەکانی هەڵدەگوت جگەرخوێن بوو کە پایەی لەو تازەکردنەوەیەدا زۆر ئاشکراو دیارە... بۆیە لێرەدا نموونەیەکی شیعری ڕۆمانتیکی جگەرخوێن وەردەگرینو لێکی دەدەینەوە.

# جگەر خوێن

ناوی شێخ مووسا کوڕی حەسەن کوری محەمەدی کوڕی مەحموودی کوڕی عەلییە، ساڵی ١٩٠٣ لە گوندی (حەسار)ی دەڤەری (مێردین) هاتۆتە دونیاوە.

جگەرخوێن لە خێزانێکی هەژارو نەدار بووەو هەر زوو دایکو باوکی نەماونو لەگەڵ برا گەورەی پێکەوە ژیاون. ناچار بووە بەکرێکاریو نۆکەری ئیش بۆ دەرەبەگو ئاغاو دەوڵەمەندەکان بکات، ساڵی ١٩٢٠ بۆ خوێندن دەچێتە دیاربەکرو زۆر جێگا دەگەڕێ، ساڵی ١٩٢٥ کە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران بەرپا بوو، و هەرزوو سەرکوت کرایەوە، ئەمە کارێکی زۆری لە جگەرخوێن کرد. ساڵی ١٩٢٧ جگەرخوێن ناچاربوو جزیرەی کوردستانی تورکیا جێ بێڵێو ڕوو بکاتە سوریاو لە (عاموودە) نیشتەجێ بێ. کە کۆمەڵەی (خۆی بوون) لەو ساڵەدا دامەزرا، جگەر خوێن یەکێ بوو لە ئەندامە چالاکەکانی. کە گۆڤاری (هاوار) دەرچوو یەکێ لەو شاعیرانەی بەردەوام شیعرییان تێدا بلاودەکردەوە جگەرخوێن بوو.

جگەرخوێن دژی ئاغاو دەرەبەگو شێخەکان دەینووسیو کردەوە خراپەکانی ڕسوا دەکردنو لەسەر هەژارو لێقەوماوو زۆر لێکراوان بە دەنگ دەهات، بەمەوە خۆی تووشی زۆر کێشەو ناخۆشی دەکرد.

دوای شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی ١٩٥٨ جگەرخوێن هاتە بەغداو لە بەشی کوردی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا دەرزی دەگوتەوە. ساڵی ١٩٦١، کە شۆڕشی کورد هەڵگیرسا، جگەرخوێن ئەگەر چی هەر لە

بەغــدابوو، بــەلام زۆر لایــەنگری شۆڕشــی دەکــردو حکومــەت لــە هەلوێستەکانی ڕازی نـەبوو و فـشاریان خـستەسەرو ئـەویش ناچـار بـوو ساڵی ١٩٦٣ بگەڕێتـەوە سـوریا. سـالّی ١٩٧٨ جگـەرخوێن ڕووی کـردە هەندەران‌و لە سوید ئـاکنجی بـوو، هـەر خـەریکی کـاری ئـەدەبی‌و چـاپ کردنی بەرهەمەکانی بوو، تا لە ١٩٨٤/١٠/٢٢ لە سوید کۆچی دوایی کردو لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمەکەیان هێنایەوە کوردستان‌و لـە قامیـشلی لەناو باخچەی مالّی خۆیان ناشتیان.

## بەرهەمەکانی جگەرخوێن:

١. ئاواو دەستوورا زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٦١.

٢. فەرهەنگا کوردی، بەرگی: ١و ٢ ، بەغدا ١٩٦٢.

٣. شەش دیوانە شیعر.

نموونەی شیعری:

## سەرمەستی ئەڤینم

١. ئــەی هــەڤالا ئەڤینــدار
تــوو ژی وەك مــن بریـنـدار

٢. کـەنگی کۆ ئـەم دگهـین هـەڤ
ب دلخوەشــــی ڕۆژو شــــەڤ

٣. گـول و چیـچەك گـەش دبـن
دلێ داران خـــوەش دبـــن

٤. ســونبول هــاویر دهــەژین
ئـــەڤ ســـتێرك دڕژیـــن

٥. چـــیا بلـنـــد دبـــن ژۆر
جهــان دبـت کەســکە ســۆر

٦. بــا تــێ بەســـازو لـــیلان
تەرومنـــــدە هـــاویر دلان

٧. ئـــاڤێن گـــۆلا ددن پێـــل
ڕوێ ڕۆژێ دبـــــت ســـێل

٨. تلـوور کەســك و زەردو ســۆر
ب بازکـــــان دچـــــن ژۆر

٩. وەکـو لـۆکس و چـرا گـەش
ڕۆنـــــی ددن شـــەڤا ڕەش

١٠. پڕگــەش دبــن گـولێ مــن
تـــەڤ درەڤـــن کــولێ مــن

١١. گــول و چيــچەك ئــەزو تــوو
قــازو ئــۆردەك ئــەزو تــوو

١٢. هــەردوو ڕەوشــا ڤــێ ژينــێ
دەنگـــێ ســـازا ئـــەڤينێ

★★ ★★ ★★

(لە سەرەتاوە سێ دێڕی بۆ لەبەرکردنە)

## لێکدانەوەی وشەکان:

هەڤاڵ : دۆست، برادەر، هاوڕێ.
ئەڤیندار : خۆشەویست، عاشق.
کەنگی : کەی، چ کاتێ.
دگهین : دەگەین.
هەڤ : یەکتر.
چیچەك : کوڵووکی پشکووتوو.
هاویر : لەهەر چوارلا، لەدەورە، نکال، تەرەف، لا، بلاو.
ستێرك : ئەستێرە، گۆلاو.
دبت : دەبێت.
تێ : دێ.
ساز : گۆرانی، ئاواز.
لیلان : دەنگی باکوت، هاشەو هاڕەی با بە بەفرەوە.

| | | |
|---|---|---|
| تەروەندە | : | چتی نایاب. |
| پێل | : | شەپۆڵ. |
| سێڵ | : | ساج. |
| تلوور | : | تەیروتوار، باڵندە. |
| بازك | : | بازدان. |
| لۆکس | : | چرای گاز. |
| ڕۆنی | : | ڕۆناکی. |
| پڕ | : | زۆر. |
| تەڤ | : | هەموو. |
| دڕەڤن | : | دەڕۆن. |
| کول | : | خەمو کەسەر. |
| ئۆردەك | : | مراوی. |
| ڕەوش | : | شێواز. |

جگەرخوێن لەم شیعرەدا، بەشێوەیەکی ڕۆمانتکیانە باسی پەیوەندی خۆیو ئەڤیندارەکەی دەکا، کە ئێستا لەبەر ئەوەی لێك دوورن، دڵبریندارن، واتە بەئێشو ئازارو خەمو خەفەتن، حەسرەت بۆ ئەو ڕۆژە دەخوازن کەبە یەك دەگەن... هەر کاتێ ئەوان بەیەك بگەن، دونیا سەراپا دەگۆڕێ، هەمووی دەبێ بە خۆشیو شادی، ئەو خۆشیەش لەم دیمانانە دەردەکەوێ: گەشانەوەی گوڵو کولووك، دەرکەوتنی سونبولو ستێرك، هەڵکشانی چیا، هاژەهاژی با، شەپۆڵدانی گۆمو

سوورهه‌ڵگه‌ڕانی خۆرو بازبازێنی ته‌یرو تلوور... ئه‌وسا له‌سایه‌ی ئه‌م دیمه‌نه جوانانه‌ی سروشت، که به‌یه‌ك گه‌یشتنی شاعیرو ئه‌ڤینداره‌که‌ی جوانتری کردوون، ئه‌وو ئه‌ڤینداره‌که‌ی دوو به‌دووبه‌یه‌که‌وه وه‌کو گوڵو کولووك به‌ده‌م یه‌کتر ده‌شنێنه‌وه‌و وه‌کو قازو مراوی له‌گه‌ڵ یه‌کتر ده‌له‌نجێنه‌وه‌و هه‌ردووکیان ده‌بن به ڕه‌وشی ژیانو ده‌نگی سازی ئه‌وین.

## گرنگترین ڕه‌گه‌زی ڕۆمانتیکی له‌م شیعره‌دا ئه‌مانه‌ن:

١. شاعیر خۆیو هه‌ڤاڵه‌که‌ی هه‌ردووکیان بریندارن، بریندارى ده‌ردی جودابوونه‌وه، ئه‌مه‌ش شاعیری تووشی ئازارێکی وا کردووه دونیای له‌به‌رچاو خستووه، وته‌نیا به گۆڕینی ئه‌م حاڵه‌تی جیابوونه‌وه‌یه، شاعیر ده‌گه‌ڕێته‌وه سه‌رباری ئاساییو دونیای له‌به‌رچاو جوانترو گه‌شتر ده‌بێ.

٢. یه‌کێ له سیماکانی تری ڕۆمانتیکی که له‌م شیعره‌دا به‌دی ده‌کرێ وه‌سفی سروشتو جوانییه. شاعیری ڕۆمانتیك هه‌میشه به‌دوای جوانیدا عه‌وداڵه‌و ئه‌و جوانییه له‌هه‌موو ورده دیمه‌نێکی سروشتدا ده‌بینێ که له‌به‌ر چاوی گه‌وره ده‌بنو هه‌موو گیانی داده‌گرن...ئه‌م جوانییه‌ش له‌م دیمه‌نانه ده‌رده‌که‌ون:

گه‌شانه‌وه‌ی گوڵو کولووك، هه‌ژانی سونبول، به‌رزبوونه‌وه‌ی چیا، که‌سكو سۆربوونی دونیا، هاژه‌هاژی (با)، شه‌پۆڵدانی گۆماو، سوورهه‌ڵگه‌ڕانی خه‌پڵه‌ی خۆر، زێده‌ڕه‌وییان تێدا کراوه، ئه‌ویش

بــەهۆی بەیــەك گەیــشتنی دوو هــاوڕێ ئــەم تــارای جوانییــەیان بەسەرداهاتووە.

٣. شاعیر دەرمانی دەردی دڵی خۆی لەو سروشتە جوانەوە دەبینێ، کە ئەم هەموو دیمەنانە شەوی تاریکی بۆ ڕۆشن دەکەنەوەو دەردو کەسەریو خەمی دڵی دەرەوێننەوە. دیسان باسکردنی شەو کە هێمای تاریکیو نا ئومێدییە سیمایەکی تری ئەو ڕێبازەیەو شاعیر بەدیمەنە گەشەکانی سروشت ئەو شەوە تاریکە ڕووناك دەکاتەوە.

٤. ئومێدی شاعیر لەوە بەرجەستە دەبێ کەخۆیو هەڤاڵەکەی لەسایەی ئەو سروشتە گیانبەخشەو دوور لەخەمو کولو کۆڤان باوەش بەیەکدا بکەن وەکو گوڵو کولووك بەدەم یەکتر بشنێنەوەو وەکو قازو مراوی بەلەنجەولار بێنو بڕۆن... لە کۆتایشدا هەردووکیان دەبن بە ڕەوشی ژیانو سازو ئاوازی ئەڤینو خۆشەویستی.

٥. لەڕووی ڕووخسارەوە شیعرەکە هەمووی بە کێشی بڕگەیی (پەنجەیی- خۆماڵی) نووسراوە، ( ٣+٤= ٧ ) بڕگەیە. ئەمەش یەکێکە لە کێشە هەرە باوەکانی شیعری کوردی.

٦. شاعیر بە سەروای مەسنەوی شیعرەکەی هۆنیوەتەوە، واتە هەر دێڕێك لەتەکانی هاوسەروانو پەیوەندی سەروا سازییان بە دێڕەکانی دیکەوە نییە. دیسان ئەمەش لەسەروا هەرە باوەکانی شیعری کوردییە. داستانە درێژەکانو چیرۆکە شیعرەکانو

هۆنراوەی فۆلکلۆری ڕەسەنی کوردەواری هەمووی بەم جۆرە سەروایە نوسراوە.

٧. وشەکانی، هەمووی وشەی کوردی پەتیو ڕەسەننو شاعیر خۆی لەبەکارهێنانی وشەی بیانی دوور خستۆتەوە.

٨. دارشتنی ڕستەکان ڕەوانو بێ گرێو گۆڵنو ڕستەی سووكو كورتی بەکارهێناوە، ئەمەش شیعرەکەی ئاسانتر کردووەو هەموو کەس خۆشی لە خوێندنەوەی وەردەگرێو پێیەوە ماندوو نابێ.

## ئەدەبیاتی کوردی سۆڤیێتی ( جاران )

لەزرووفی تایبەتی کوردی یەکێتی سۆڤیێتی جاراندا، ئەدەبیاتی تازەی کوردی سۆڤیێتی لەسەر بناغەی ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی دامەزرا. گەشەسەندنی ئەو ئەدەبییاتە شان بەشانی لێکۆڵینەوەو سوود بینین لە داستانی دەوڵەمەندی میللی ڕۆیشتو، بوو بەیەکێك لە نیشانە ئاشکرا بەرزەکانی پلەی گەشەسەندنی ڕۆشنبیری کوردی یەکێتی سۆڤێت. بەم جۆرە گەلێك بەرهەمی ئەدەبی وایان نووسی کە ناویان لەمێژووی ئەدەبی کوردی ئەم سەردەمەدا تۆماربکات لەمانە: عەرەبی شەمۆ، حاجی جندی، ئەمینی ئەبدال، وەزیری نادر، جاسمی جەلیل، موسەیی ئاخوندۆڤ ، یوسفی بەکۆ، باخچۆیی سلۆ... هتد دیارن.

لەناو نووسەرانی کوردی یەکێتی سۆڤێتدا، عەرەبی شەمۆ هەر ئەوە نییە کە لە یەکێتی سۆڤێتدا ناوبانگی هەبێت، بەڵکو لەدەرەوەش ناوبانگێکی زۆری هەیە. عەرەبی شەمۆ دەستی بەنووسینی گوتار کرد لەبوارە جیاجیاکانی کاروباری ڕۆشنبیری کوردیو ژیانی کۆمەلایەتی لەو گوندانەی کە کوردی ئێزدی لێ نیشتەجێبوون، هەروەها لەبواری ئەدەبو ئامادەکردنی ڕۆژنامەی (زاریا فوستوکا– کازیوەی ڕۆژهەلات) کاری کرد. نووسینەکانی عەرەبی شەمۆ بەزمانی ڕووسی بوون، چونکە ئەم نووسینانە بۆ ئەو زاناو ڕۆشنبیرو ڕۆژهەلاتناسانەی ئەورووپی بوون کە گرنگییێکی تایبەت دەدەنە لێکۆڵینەوەی کوردی بەشێوەیەکی گشتی.

یەکێك لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی کە چیرۆکی (شڤانی کورد)ەو سروشتی (ئەفتۆبیۆگرافیا- مێژووی ژیان)ی هەیە، هەر لە ساڵانی (سیی)دا بەکوردی بڵاوکرایەوەو زوو بەزوو کرا بە ئەرمەنیو ڕووسیو ئەڵمانی. لە ساڵی (١٩٥٧)دا بەزمانی گورجی بڵاوکرایەوەو پێش ئەوەش کرابوو بە فڕەنسی. گورجو گۆڵیی ئەدەبی (عەرەبی شەمۆ) هەر لە سەرەتاوە دیاربوو، (شڤانی کورد)و (کوردی ئەڵەگەز)[1].ی لەبەرهەمە کۆنەکانی کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێتین.

لەم دوو بەرهەمەدا نووسەر ڕاستگۆیانە نەخشەی ژیانی زەحمەت کێشانی یەکێك لە ناوچەکانی کوردنشین دەکێشێتو سەختی ئەو ژیانە لە ژێر دەسەڵاتی کۆندا پیشان دەداتو وێنەی ڕەنج خوران دەکێشێتو ئەوەشمان پیشان دەدات کە چۆن ئەو ڕەنج خۆرو کۆنە پەرستانە لەسەرەتای دامەزراندنی ڕژێمی سۆشیالیستدا دەبوونە بەربەستی جێنشین بوونی کوردانی کۆچەر. لەم دوو چیرۆکەدا تەواو پەیدابوونی شارەزاو کادری کورد بەدی دەکرێت. عەرەبی شەمۆ لە ساڵی (١٩٣١)دا یەکەم چیرۆکی سەر شانۆی خۆی بەناوی (کۆچاکێ دەرەڤین- خوا پەرستی درۆ)وە بڵاوکردەوە، لەوێدا پەردە لەسەر پاشماوەی پروپووچو بیری کۆنەپەرستی لەناو کورددا بڵاو، هەڵدەماڵێت.

هەر لەم ساڵانەدا عەرەبی شەمۆ بە نووسینو بە وەرگێڕان گەلێك نامیلکەی سیاسیو هۆشیارەکەرەوەی بۆ کوردی سۆڤێتی دەرکرد.

---

(١) ئەلەگەز: چیایەکی کوردنشینە لە ئەرمەنستانی سۆڤیتی.

## کورتەیەك لەژیانی ( عەرەبی شەمۆ )

ئەم نووسەرە بلیمەتە ناوی (عەرەب)ە کوڕی (شێخ شەمۆ)ی شێخ (شامیل)ە لە بنەماڵەیەکی کوردی یەزیدییانە لە ساڵی (١٨٩٥)دا لە گوندی (سووسر) لە ناوچەی (قارس)لەدایك بووەو سەختی ژیانی دیوەو لەهەموو مەیدانێکی ژیاندا تێکۆشەرە. ئەگەر سەیری تۆماری بەرهەمو نووسینەکانی بکەین، لەپاڵ ئەوانەدا کە باس کراونو لەپاڵ گەلێك گوتارو نامیلکەی سیاسیو کۆمەلایەتیو زمانەوانیدا ئەم بەرهەمە ئەدەبیانەی تریش دەبینین:

١. ڕەبەن[1]، ١٩٣٠

٢. بەربانگ[2]، ١٩٥٧.

٣. ژینا بەختەوەر، ١٩٥٩.

٤. کوردی ئەرمەنستان، ١٩٦١ (سیناریۆیە بۆ سینەما).

٥. دمدم، ١٩٦٦ ئەمەش ڕۆمانێکی[3] گەورەیە لە چیرۆکی ڕووداوو مێژووی قەلای دمدمەوە وەرگیراوە.

٦. حەکایەتی کوردی ناو خەڵك، ١٩٦٧.

٧. کۆمەڵێك لەبەرهەمەکانی کۆکراوەی عەرەبی شەمۆ ١٩٦٩.

---

(١) ڕەبەن: هەژار.

(٢) بەربانگ: بەیانی.

(٣) ڕۆمان: چیرۆکی درێژ.

ئەگەر عەرەبی شەمۆ بە بەرهەمترینو بەناوبانگترین نووسەری کوردی سۆڤێتی بێت ئەوا حاجی جندی، جاسمی جەلیل، ئەمینی ئەبدالْ، موسەیی ئاخۆندۆڤ، باخچۆیی سلۆ، قاچاغی مراد،... هتد بە شاعیرو نووسەر ناویان دەرکردووەو خزمەتێکی زۆری زمانی کوردیان کردووە. هەروەها بە کۆکەرەوەی سامانی دەوڵەمەندی فۆلکلۆری نەتەوەی خۆیان بەناوو دەنگن. دەبێت ئەوە ڕەچاو بکەین کە گەورەتر کار بۆ تۆمارکردنی فۆلکلۆری کوردیو وەرگێڕانی بە ئەرمەنیو ڕووسی لە یەکێتی سۆڤێتدا بووەو لەلایەن زانایانی ئەم وڵاتەوە بووە.

حاجی جندیو ئەمینی ئەبدالْ خەباتێکی زۆریان لەڕێگای بووژاندنەوەی زمانی کوردی لە وڵاتی سۆڤێتدا کردووە. بەهۆی نووسینەکانییەوە نەتەوەی کوردیان بە گەلی سۆڤێتیو گەلانی تر ناساندووە. هەروەها بە هاوکاری یەکتر چیرۆکی (لازۆ)یان لە ئەرمەنییەوە وەرگێڕایە سەر کوردی، یەکێك لە پلە گرنگەکانی گەشەسەندنی ئەدەبیاتی کوردی سۆڤێتی بە بڵاوکردنەوەی کۆمەڵەی (فۆڵکلۆری کوردی) دەست پێ دەکات کە لەساڵی (١٩٣٦)دا لە یەریڤان چاپکراوە، لەم کۆمەڵەیەدا گەلێك باسی وەك خۆشەویستیو باری خێزانی کوردو حاڵی ژنانو دەسەڵاتی سەرتیرەو خاوەن دەسەڵات، جێگەی شیربایی[1]. لە ژیانی خێزاندا، میوانداری، ئازایی، کوردان... هتد، ڕەنگی داوەتەوە.

---

(١) شیربایی: قەڵەن، هەق.

لـه ئـه‌ده‌بیاتی کـوردی سـۆڤێتی ئـه‌م سـه‌رده‌مه‌دا ده‌نگـی شـیعری لیریك[1] و بابه‌تی داستان ئامێز دیاره. له به‌رهه‌مێکی حـاجی جندیـدا کـه ناوی (شارێ) بوو، باسـی یاسـای بـه شـوودان‌و شـیربایی ده‌کـرد کـه تـا سه‌رده‌می شۆڕشی ئۆکتۆبه‌ر له چیاکانی پـشت قه‌فقاسـدا لـه‌ناو نـه‌وه‌ی کۆنـدا مـابوو. لـه‌و به‌رهه‌مـه‌دا نـاڕه‌وایی‌و سـه‌ختی پـه‌یڕه‌وی کـۆن به‌ڕوخسارێکی هونه‌رمه‌ندانه ده‌ربڕاو بوو. ئادگاری[2]، (شارێ) که قۆچـی قوربانی ده‌ستی شـیربابیه به‌رامبـه‌ر بـه‌و باوکـه پـیره‌ی کـه بـه ده‌سـتی خۆی کچه خۆشه‌ویسته‌که‌ی به‌ره‌و مه‌رگ ده‌بات، هاوارێکه به‌رامبه‌ر بـه‌و ڕه‌فتاره کۆنه. شاعیر زۆر ساده باسی ئازاردانی کچ‌و به‌زۆر بـه شـوودانی ده‌رده‌خات که ئه‌مه له‌کۆندا سه‌ره‌نجامی هه‌موو کچێکی کورد بووه.

ئـه‌ده‌بیاتی گـه‌لانی سـۆڤێتی ده‌ورویـشت کاریـان کردووتـه سـه‌ر ئـه‌ده‌بیاتی تـازه‌ی کـورد. لـه بـه‌رهـه‌می تـازه‌ی نووسـه‌راندا باسـی مه‌سه‌له‌کانی ئه‌م چـه‌رخه ده‌بینین، وه‌ك ئـه‌وه‌ی لـه‌و کۆمه‌ڵـه شـیعره‌دا دیاره که ناونراوه (شاعیرانی کـوردی سـۆڤێتی، یـه‌ریڤان، ١٩٥٦) یـا لـه کۆمه‌ڵه‌ی (ڕێگای نوێ)دا (تبلیس ١٩٥٨) یا له‌کۆمه‌ڵه هۆنراوه‌ی شاعیری کـورد باخـچۆیی ئیـسکۆدا (تبلـیس ١٩٦١) دیـاره. ده‌سـته‌ی کـۆنی شاعیرانی کوردی سۆڤێتی پێکـه‌وه کۆمه‌ڵـه هۆنراوه‌یـه‌کیان ده‌رکـرد کـه شیعری ئه‌مینی ئه‌بداڵ‌و یوسفی به‌کۆو جاسمی جـه‌لیل‌و حـاجی جنـدی‌و

(١) لیریك: هه‌ست بزوێن، سۆزی.

(٢) ئادگار: دیمه‌ن

وەزیری نادری تێدا بووە. پاش ئەوان شاعیرانی کوردی گورجستان کۆمەڵە هۆنراوەیەکیان چاپکرا کە بریتی بوو لە بەرهەمی جەلیلی ئاجۆ، ئادۆی جەنگۆ، مۆرۆی مەمەد، قاچاغی مراد، باخچۆی سلۆ.

لەپاڵ ئەو باسەنەدا کە لەئەفسانەی خەڵکەوە وەرگێراون، هەروەها ڕەنگدانەوەی ڕووداوی ژیان تەواو ئەم شیعرانەیان وا لێ کردووە کە لە ژیانی کوردی سۆڤێتیدا ڕەنگدانەوەی ژیانی تازەو کوردی ئەرمەنستان بەشێکی زۆری لەشیعری ئەمینی ئەبداڵو ئادۆی جەنگۆو عەزیزی سلۆی بەرکەوتووە. هەر وەك جەردۆی گەنجۆ لە چیرۆکی (گوندی تازە)دا تابلۆی پایزی ئەڵەگەزمان بۆ دەکێشێت لە هەمووی بەرهەمی کۆنو تازەی شاعیرانی کوردی سۆڤێتیدا لە پاڵ هەموو ئەو باسانەدا کەوتراون، سۆزێکی تایبەتی خۆشەویستی نەتەوەی کورد دەبینێت. سۆزی کوردێکی خۆ بە مێژوو و سەرفرازیو ئازایی خەڵکەوە بەستوو، سۆزی کوردێك کە هەست بە هەموو ڕابواردوو و ئێستای ژیانی کورد بکات.

ئەدەبیاتی کوردی سۆڤێتی نەوەیەکی تازەی لە شاعیرو نووسەر پێگەیاند، لەوانە: میکایلی ڕەشیدو قاچاخی مرادو عەزیزی سلۆو عەتاری جەردۆو کارلینی چاچانو شکۆی حەسەنو ئۆردیخانی جەلیلو چەند شاعیری تر کە بەردەوام کۆمەڵە شیعریان لە تبلیسو یەریڤان چاپ دەکرا.

لەم ساڵانەی دواییدا بەرهەمی نووسەرو شاعیرانی کورد بەژمارەیەکی زۆر لە گەلانی یەکێتی سۆڤێت ڕاگەیەندرا. ئەمەش لەڕێی وەرگێڕانە سەر ڕووسیو گورجیو ئەرمەنیو ئازەربایجانیو زمانانی ترەوەیە. هەروەك

نووسەرو شاعیرە کوردەکان وایان کرد کە گەلی کوردی سۆڤێتی بەزمانەکەی خۆی بەرهەمی تۆلستۆیو پوشکینو لێرمەنتۆڤ و کریلۆڤ و شاعیرو نوسەری تر بخوێنێتەوە.

ئەگەر تاقە ڕەخنەیەك لە شاعیرانی کوردی سۆڤێتی بگیرێت ئەوەیە کە شاعیرەکانیان بەهۆی ئەو ڕەوشە مێژوویییەوە کە باسمان کرد، لەسەر بناغەی پتەو ورەنجی سەدان ساڵی ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردی دانەمەزراوە، لەبەر ئەوە زۆرجار ساکارییو سادەیی لەزمانو دەربڕیندا دەبینرێتو ئەو پێزو چێژەی ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردی تێکەڵ بە بناغەو ڕەگەزەکانی ئەو شیعرانە نەبووە. ئەمە بۆ شیعر، بەلام لە چیرۆکدا ئەوا ڕەوشی ئەوانو پێشکەوتنی وڵاتەکە وای کردووە کە گەلێك ڕەگەزی هونەری چیرۆك نووسینی ڕۆژئاوا تێکەڵ بە بەرهەمی چیرۆکیان ببێتو شتێکی تازەو بە نرخ بێتە کایەوە.

ئەم باسەی خوێندتان، باسێکی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی سۆڤێتی بوو، بەلام ئەگەر بمانەوێ هەموو چالاکی ڕووناکبیریو کەلچەری کوردی سۆڤێتی باس بکەین، ئەوا لەپاڵ ئەوەدا کە باسی شاعیرانی لاوو ئەم سەردەمەی ئەو وڵاتە پێویستە. دەبێت لای گەلێك باسی تر بووەستین کە هەریەکیان پیشاندانو لێکۆڵینەوەی زۆریان دەوێت وەك:

١. پەیدابوونو بەرەو پێش چوونی کتێبی قوتابخانە.

٢. ڕۆژنامەگەرییو ڕۆڵی ڕۆژنامەی (ڕێیا تازە).

٣. زمانەوانیو لێکۆڵنەوەی زمانی کوردی.

٤. فۆلکۆری کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوە.

٥. دەستنووسی کوردی کۆنو لێ وردبوونەوەی وەرگێڕانو چاپکردنی.
٦. نووسینەوەی مێژووی کوردو لێکۆڵینەوەی.

لەمانەو چەند مەیدانی تردا گەلێك ناوی درەوشەدار دەبینین کە هەریەکەیان وانەی تایبەتیان دەوێت. بەڵام وەك دەزانن باسەکەی ئێستامان بەشێوەیەکی کورت بۆ ئەدەبیات تەرخانکراوە.
یەکێك کە بیەوێت دەتوانێت لە زۆر سەرچاوەدا بەدوای ئەم باسانەدا بگەڕێت.

دواشت کە دەبێت بووترێت، ئەوەیە کە ئەم بەرهەمانەی باسمان کردن، هەموو لە بنەڕەتدا بە کرمانجی ژووروو نوسراونو شتێکی تێکەڵ لە بەشی (هەکاریو بۆتانو بایەزیدی) ئەو دیالێکتەیە. بەڵام بەرەو پێش چوونی تایبەتی وای کردووە کە لەبناغەی کلاسیزمییەکەی کرمانجی ژوورەوە دووربنو لەجیاتی عەرەبیو فارسیو تەنانەت تورکیش زاراوەی تازەی زمانی تری تێکەڵ ببێت. لەگەڵ ئەوەشدا بەتایبەتی لەپاش شۆڕشی چواردەی تەمموزی (١٩٥٨)ی عێراقەوە، ڕوناکبیرانی کوردی سۆڤێتی، چ بۆ خۆیانو چ لەبەر هەمیاندا لە گەشەسەندنی ئەدەبیاتی کوردی عێراق دانەبڕاون.

ئەم باسە بە دەستکارییەوە لە پەرتووکی
زمانو ئەدەبی کوردی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی وەرگیراوە
دانانی (د. عزالدین مستەفا)و هاوڕێکانی، چاپی دوازدەهەم.

# جاسمێ جەلیل

هۆزانڤانو نووسەرو چیرۆك نووس جاسمێ جەلیل لە ساڵی ١٩٠٨ لە گوندی (قزیلقۆڵی)ی سەر بەشارۆچکەی (دیگۆرێ) قەزای (قەرسێ) لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران لەدایکبووە. لە تەمەنی (١٠) ساڵیدا (٤٠)تا (٥٠) کەس لە بنەماڵەکەیان دەکەونە بەر هێرشی تورکانو هەموویان دەکوژرێن، تەنیا جاسمی جەلیل نەبێت کە ئەو کاتە، واتە لەکاتی هێرشەکە لەچیای شوانی بەرخان دەبێت. لەماوەی ژیانیدا زۆر ناخۆشیو تاڵیو بێکەسی دیوە، ماوەیەك لەگەڵ هەزاران منداڵی بێ چاودێری دیکەی کوردو ئەرمەنی وەك خۆی، لە خانەی هەتیواندا دەژیت. لەشاری (باکۆ) دەست بە خوێندن دەکاتو لەبەر زیرەکی ڕەوانەی خوێندنی باڵای لەشکری لەشاری (تەفلیس) دەکرێ.

لە تەمەنی (٢٣) ساڵیدا جاسمی جەلیل دەست نیشان دەکرێت بۆ خزمەتکردنی بزاڤی ڕۆشنبیری کوردی لەوڵاتانی ئەرمینیا، ئازەربیجان- گورجستان کە دەرفەت بەخوێندنو نووسینی کوردی بە ڕێنووسی لاتینی دراوە ئەمەش وەك ناوەندێکی ڕەوشنبیری بووە بۆ پێگەیاندنی قوتابی کوڕو کچی کوردو لە هەموو کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی ڕوویان لێ دەکرد. لە ساڵی ١٩٣٢ جاسمی جەلیل دەبێتە بەرپرسی سەرەکی ئامادەکردنو چاپکردنی کتێب بەزمانی کوردی، لەساڵی ١٩٣٨- ١٩٤١ لە یەریڤاندا لە ئەنستیتۆی نێو دەوڵەتی (کۆلێژی زمانەوانی) زمانو ئەدەبیات دەخوێنێو بەسەرکەوتوویی دەردەچێت.

پاشان بۆ ماوەی (٣) ساڵان لە ئەنستیتۆی (ماف) دەخوێنیٚو دیبلۆمی دووەمی خوێندنی باڵا وەردەگرێت ماوەیەك دەبێتە مامۆستای زمانی کوردی لە قوتابخانەی لەشکری تایبەت لە ڕووسیا. ژیانو خەباتی ئەم کەڵە ڕۆشنبیرە زۆر بەنرخ بوو ناوی جاسمی جەلیل وەك ڕۆشنبیرو شاعیرێکی کورد لەوڵاتانی ئەرمەنستانو ڕووسیاو ئۆکرانیا ئاماژەی پێدراوە. لەساڵی ١٩٦٣ بۆتە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی سۆڤیەتو زۆرجاران بۆتە نوێنەری یەکێتی نوسەران لە کۆنفرانسو کۆنگرەکانی مۆسکۆ لە بواری هونەریشدا جاسمی جەلیل توانی (٧٠٠) گۆرانیو ئاوازی کوردی لە رادیۆی یەریڤان تۆمارو بلاّوبکاتەوە، ئەمەش وەك بناغەیەکی پتەو زێرینی کورد بوو بۆ پێشکەوتنی مۆسیقاو هونەری کوردی. جاسمیٚ جەلیل یەکێك بوو لەو کەسانەی کە بناغەی ئەدەبیاتی کوردی لە سۆڤیەت دایناوەو زۆربەی شیعرەکانی ئەم شاعیرە کراون بە ڕووسیو لەڕێگای ڕۆژنامەکانی (پراڤدا)و (ئەزڤیستیا) چاپو بڵاودەبوونەوە. جاسمیٚ جەلیل باشترینو نایابترین بەرهەمی بێگانە بۆ سەر زمانی کوردی وەرگێراوە بۆ ئەوەی خوێندەوارانی کورد سوودی لیٚ وەربگرن.

جاسمی جەلیل وەك کورد پەروەرێك لەکاتی کیمیا بارانکردنی شاری هەڵەبجە وەك کوردێکی بریندار لەڕێگای نامەیەکی کراوەدا بۆ سەرۆکی ئەو کاتەی سۆڤیەت داوا لە حکومەتو سەرکردایەتی سۆڤیەت دەکا هەڵوێست نیشان بدەن سەبارەت بەم کارەساتەی هەڵەبجە. جاسمی جەلیل (٧٠) حەفتا ساڵی پڕ لە تێکۆشانو ماندووبوونو شەونخونی لە

پێناوی بەرەو پێش بردنی ئەدەبو ڕۆشنبیری کوردی لە سۆڤیەتی جاران بەو پەڕی دڵسۆزیو لێهاتوویی کاری تێدا کردووە، لێزانیو شارەزایی ئەو مرۆڤە هەموو دەرگایەکی هونەرو ئەدەبو ڕۆشنبیری گرتۆتەوە، بەلاّم بەداخەوە ئەم مرۆڤە بلیمەتە لەساڵی ١٩٩٨ بەبێ دەنگی ماڵاوایی لێ کردینو ئەستێرەیەکی دیکەی ڕۆشنبیری فەرهەنگی کوردی کوژایەوەو لە گۆڕستانێك لەنزیکی شاری یەریڤان نێژراوە. ئەم بەرهەمانەی کە جاسمێ جەلیل بۆمانی بەجێ هێشتوون (ڕۆژێن مـن، کەلامێ چیا، ئودا کوردا، زۆزان). ئەمەش یەکێکە لە شیعرەکانی جاسمێ جەلیل بەناوی:

## حوبا شڤان

١. شڤانی جاهل رۆحێ تە نازك
ڕۆحێ تە نازك وەك زارۆك بێچك
ڕۆحێ تە هەڤال، بۆی جەو کانیانە
رۆحی تە خوسیا کولیلك، کارزیانە

***

٢. شڤانێ جاهل، زانم رۆحێ تە
زمانێ عەمر، تەبیەتێ زانە
لێ وەختا ئەزم، ئەزم ل رەخ تە
دمبێی کلیتم ئەز بۆی زارێ تە

***

٣. ئـو تـو بەنـد دبـی زمـان لا لۆمـە
بەڵی فەعم دکەم ئەز ژ رۆحێ تـە
بەلێ، کێم دبهێم خەبەرێ تـە دوور
حەزنا فکراتە، بەحرا بی بوو حوور

★★★

٤. زانم بلـــوورە، بلـــوورە زارێ تـــە
سەر وی دلێـزن تلی پێـچی یـێ تـە
ســەوتو مــەقام لێ دبنــە کــانی
حوببا تـە ئۆکیان، ئۆکیانـە ئـەینی

★★★

٥. لێ وەختا مـن راتـوو خەبـەری ددی
لێڤــێ تــەنازك، نــاز درجفـــن
وەختـا بلـووری تـو کـو هەلـددی
حووب، سەوتو مەقام چەمکی دکێشن

★★★

٦. خـوو نافـا ل سـەر گـولو سۆسـەنا
ب ئــەڤینتیا ئــەو وانــد دنــچە
کـەرێ پـەز مووتـاج مینـا ئـەڤینا
چـێری بیردکـە، دوور تــە دچـڤە

★★★

٧. تـــــەنێ مـــــرازەك دلى مندانــــە
خـــازى ببوومـــا بلـــوورا دەســـتاتە
حويـــــبو ئـــەڤینتیا دلێ تەدانـــە
مـــن نجانـــدا نـــاب وان تلـــی تـــە

★★★

٨. وی چـــاخی ئـــەزێ نـــەمر بمێـــنم
بـــێ منـــەت، بـــژیم مینـــا تـــەیرەوا
کـوو سـەر لێڤـی تـە تمـێ بلـووربم
ئـــوببم کانیـــا ســـەوتو مـــەقاما

(کۆپلەی یەکەم بۆ لەبەرکردنە)

## لێکدانەوەی وشەکان ( شرۆڤەکرنا پەیڤان ):

شڤان : شوان
جاهل : جەحێل، لاو
زارۆك : منداڵ
بێچك : بچووك
بۆی : بۆ
جە : جۆگە
خوسیا : ڕاهاتوو
کوولیلك : کارژۆلە

| | |
|---|---|
| کارزیان | : بەرخ زان |
| عەمر | : هەموو ژیان |
| تەبیەتیّ | : تەبیعەتی سروشت |
| زانە | : دەزانێت |
| ئەزم | : منم |
| لەرەخ تە | : لەلای تۆ |
| دەبێی | : دەڵێی |
| کلیتم | : کلیم |
| زاریّ تە | : دەمی تۆ، زمانی تۆ |
| تۆ بەند دبی | : تۆ دەوەستیت |
| فەعم دکەم | : فەهم دکەم، تیّ دەگەم |
| کێم | : کەم |
| دبهێم | : دەبیستم |
| خەبەر | : قسە |
| بیّ بوو حوور | : بیّ کۆتایی، بیّ پایان |
| بلوور | : بلوێر |
| دلێزن | : یاری دەکەن |
| تلی، پێچی | : پەنجە، قامك |
| ئۆکیان | : موحیت، ئۆقیانووس |
| ئەینی | : هێمن |
| لێڤ | : لێو |

| | |
|---|---|
| درجفن | : دەلەرزن |
| خووناڤ | : شەونم، ئاورنگ |
| ئەڤینیٚ | : خۆشەویستی |
| دنچە | : دەچێت |
| مینا | : وەك |
| کەریٚ پەز | : کارژۆلە، بەرخ |
| مووتاج | : موحتاج |
| چێریٚ | : ماوەیەك |
| بیرۆکە | : لەبیردەچێت |
| دچڤە | : دەجوولێت |
| مراز | : هیوا |
| فازی | : خۆزگە |
| وی چاخی | : ئەو دەمە |
| تمیٚ | : هەموو، تەوا |

# پەخشانی کوردی

وشەی پەخشان وەکو لەفەرهەنگدا هاتووە لەوشەی پەخش وەرگیراوە کە بەمانای بڵاودێ وەکو زاراوەش وشەی پەخشان بۆ ئەو بەرهەمە ئەدەبیی‌و زانستییە بەکاردێ کە نەخرابێتە قالبی کێش‌و سەرواو زمانی هەڵبەستەوە، ئاشکرایە یەکەم دابەشکردنی ئەدەب لەڕووی شێوەو ڕووخسارەوە، ئەوەیە کە ئەدەب دەکا بەدوو جۆر:

**هەڵبەست‌و پەخشان**: لەزۆر کۆنەوە هەڵبەست‌و پەخشان هەبوونەو نموونەی هەردوو جۆرمان لەسەردەمی کۆنەوە بۆماوەتەوە، ئەگەرچی لە زۆربەی ئەدەبی نەتەوەکاندا لە کۆنا پەخشان کەمتربووەو هەڵبەست زیاتربووە، بەلاّم لەسەردەمی ئێستاماندا پەخشان لە هەڵبەست زیاتر بەکاردێ بۆ نووسینی هونەرە (جۆرە) ئەدەبییەکانی بەلاّم ئایا هەڵبەست‌و پەخشان کامەیان کۆنترە؟ لەم بارەیەوە دوو ڕای جیاواز هەیە:

**ڕای یەکەم:** دەڵێ هەڵبەست لەپەخشان کۆنترە. ئەوانەی ئەم ڕایە پەسەند دەکەن بەڵگەیان ئەمەیە:

١. هەڵبەست زمانی هەست‌و سۆزەو لە ویژدانی شاعیرەوە هەڵدەقوڵێ، کەچی پەخشان زمانی هۆش‌و ژیرییەو لە مێشکەوە پێدەگا جا لەبەر ئەوەی مرۆڤ پێشتر هەست‌و سۆزی جولاوەو ویژدانی کەوتۆتە کار ئینجا هۆشی گەشەی سەندووەو پێگەییووەو دەسەلاّتی

بەسەردا پەیدا کردووە، بەو پێیە دەبێ هەڵبەست پێش پەخشان هەبووبێ.

٢. هەڵبەست لەبەر کێشو سەرواو ئاوازەکەی لەبەرکردنی ئاسانەو دەکرێ بە دەقی خۆی پارێزگاری بکرێ هەروا بێتە خوارێ، کەچی پەخشان لەبەرکردنی سەختترو ڕاگرتنی دەقەکەی زەحمەتترە مەگەر لە هەندێ ڕستەی کورتی سەروادارو کێشداری وەکو قسەی نەستەقو پەندی پێشینان نەبێ.

٣. لەلای هەر نەتەوەیەك کۆنترین دەقی ئەدەبی مابێتەوە هەڵبەستە نەك پەخشان، وەکو داستانی گلگامشی سۆمەریو ئەلیادەو ئۆدیسای هۆمیرۆسی یۆنانیو دراما بەناوبانگەکانی یۆنان کە هەموو بە هەڵبەست بوون.

ڕای دووەم: دەڵێ پەخشان پێش هەڵبەست هاتووە. لایەنگرانی ئەم ڕایە، ئەم بەڵگانەیان هەیە:

١. مرۆڤ یەکەم جار کە زمانی پژاوەو قسەی کردووە، بە ئازادی هەستو بیری خۆی دەربڕیوە، پاشان هەوڵی داوە ئەو هەستو بیرە بخاتە ناو قالبی کێشو سەرواوە، لە دونیا شتی ئازاد پێش شتی دەستوور بەند دەکەوێ، بۆیە پەخشان کۆنترە چونکە ئازادەو هەڵبەست دواتر داهاتووە چونکە بەپێی دەستووری تایبەتی دادەڕژێ.

٢. لەسەردەمی هەرە کۆنەوە پەخشان (پەخشانی سەروادار) لە پەرستگاکان بەکارهاتووەو کتێبە ئاسمانییەکانیش هەر هەموویان بە پەخشان نووسراون، جگە لەوەی نووسینی کورتی سەر دەرگاو دیواری کۆشكو قەڵا کۆنەکانو کێلی گۆڕەکان بە پەخشان بووە، بۆیە دەبێ پەخشان پێش هەڵبەست هەبووبێ.

لەم دوو ڕایە کامەیان؟ زەحمەتە مەسەلەی پێشکەوتنی هەڵبەست یان پەخشان یەك لا بکرێتەوە، بەڵام لایەنگرانی ڕای یەکەم زیاترنو بەڵگەکانیان بەهێزترن. لە کوردیشدا کۆنترین بەرهەمی ئەدەبی کە دۆزرابێتەوەو تا ئێستا مابێتەوە ئەوەیە کە بەهەڵبەست نووسراوە نەك پەخشان. دوور نییە دوا ڕۆژ دەقی هەڵبەست یا پەخشانی لەوانەی ئێستا کۆنتر بدۆزرێتەوە. ئەمەش شتێکی ترە.

## جیاوازی نێوان هەڵبەستو پەخشان:

هەڵبەستو پەخشان، وەکو دوو شێوەی (شکل) نووسینی ئەدەبیی، لە زۆر لاوە جیاوازن. گرنگترین جیاوازییان ئەمانەن:

١. هەڵبەست لەویژدانو سۆزەوە هەڵدەقوڵێ، کەچی پەخشان زادەی هۆشو ژیرییە، واتە هەڵبەست لەگەڵ دڵو ویژدانی مرۆڤ دەدوێو هەوڵ دەدا بیبزوێنێ، کەچی پەخشان لەگەڵ ئەقڵو هۆشی مرۆڤ دەدوێو هەوڵ دەدا بە ژیربێژیو وردەکاری ڕاستەقینەکان بخاتە

ڕوو، هەر لەبەر ئەمەشە هەڵبەست زیاتر کەسێتی شاعیری پێوە دیارەو پەخشان کەمتر کەسێتی نووسەرەکەی دەردەخا.

٢. زمانو دەربڕین لە هەڵبەستدا ئاوێتەییە (تەرکیبی)یە کەچی لە پەخشاندا شیکارییە (تەحلیلی)یە، چونکە هەڵبەست پێویستی بە چڕی دەربڕینو کورتبڕی هەیە، کەچی پەخشان پێویستی بە شیکردنەوەو درێژە پێدانو لێکدانەوە هەیە.

٣. کێشو سەروا دوو ڕەگەزی زەقو بنچی هەڵبەستن بەتایبەتی هەڵبەستی دێرین، کەچی ئەمانە لە پەخشاندا مەرج نین، تەنیا لە هەندێ پەندو قسەی نەستەقدا سەروا هەیە، ئەویش بۆ جوانییە.

٤. لە هەڵبەستدا، زۆرجار کێشو سەروا شاعیر ناچار دەکەن ڕیزی وشەکان لەڕستەدا تێك بداو وشەکان پاشو پێش بکا، بۆیە شاعیر لێی ناگیرێ وشە لە هەر شوێنێکی ڕستەی هەڵبەست دابنێ، بەمەوە دارشتنی ڕستەکانی ناسروشتی دەردەچن کەچی لە پەخشاندا ڕیزی وشەکان دەبێ لەشوێنی خۆی بێو، بۆیە ڕستەی پەخشان ڕەوانترو ئاساییترە لەهی هەڵبەست.

٥. نەخشەی دابەشبوونی هەریەکە لە هەڵبەستو پەخشان لەسەر لاپەڕەدا، جیایە. واتە تۆبۆگرافیای دەقی هەڵبەست جیایە لە هی پەخشان. لە شیعری کلاسیزمی هەر دێڕەی بەسەر دوو لەتدا دابەش دەبێو سەرواش بەگوێرەی جۆری هەڵبەستەکە دەگۆڕێ، غەزەلو قەسیدەو چوارینو مەسنەویو موستەزاد... هەر یەکە جۆرە سەروایەکی هەیەو جۆرە نەخشەیەك بە هەڵبەستەکە دەدا لەسەر

لاپەڕەدا، کەچی پەخشان هەمووی بەسەر یەکەوە دەنوسرێو تەنیا بە تەواوبوونی پارچەیەک، دێڕێکی نوێ دەست پێ دەکا.

## جۆرەکانی پەخشان

### پەخشان بە پێی ناوەڕۆك دەکرێ بە دوو جۆر:

**١. پەخشانی هونەریی        ٢. پەخشانی زانستیی.**

١. **پەخشانی هونەریی:** ئەو پەخشانە ئەدەبییانە دەگرێتەوە کە هەستو سۆزی نووسەرەکەی پیشان دەدا. نووسەر لەم جۆرە پەخشانەدا لە ڕوانگەی خودیو تایبەتی خۆیەوە سەیری ژیانو کۆمەڵو سروشت دەکا. ئەم جۆرە پەخشانە خۆی لەبابەتی مەوزوعی وەکو ئابووریو زانیاری گشتیو هتد لادەدا. نموونەی پەخشانی هونەریی، وەکو وتاری ئەدەبی، چیرۆك، کورتە ڕۆمان، ڕۆمان... ئەم جۆرە پەخشانە پێویستە شێوازێکی بەرزی هەبێ، وشەکانی بژاردەبنو دارشتنی پتەوبێ. ئەم جۆرە پەخشانە هونەرییە لەڕووی شێوەوە دەکرێ بەدوو جۆر:

ئ- پەخشانی سەروادار        ب- پەخشانی ڕەوان

**ئ- پەخشانی سەروادار:** ئەو پەخشانە هونەرییەیە کە بەشەکانی ڕستەی دوو دوو سێ سێ یان... هاوسەروا دەبن. ئەم سەرواداریيە هەنگاوێ لە هەڵبەست نزیکی دەکاتەوە. تەنانەت هەندێ لەوانەی باسی سەرەتاکانی هەڵبەستیان کردووە، دەڵێن لە پەخشانی سەروادارەوە

پەرەی سەندووەو پێگەیشتووە کە لەپەرستگاکان باو بووە. نموونەی پەخشانی سەروادار، وەکو عەلائەدین سەجادی لە پێشەکی باسی مەلای جەباریدا، دەڵێ:

(پیری مەیخانەی خەیاڵ شناسان، بادە ئەنۆشێ لە جەرگەی خاسان. ڕشتەی مرواری قسەو باسیە، نەوای قومرییان وێنەی ڕازییە. بێنی هەناسەی شنەی شەماڵە، تێکەڵ بە بیری بەرزی خەیاڵە...)

(بۆ لەبەرکردنە)

لەم جۆرە پەخشانەدا، دەبێ پارچەکانی هەر ڕستەیەك سەروایان یەك بێ، جا پارچەکان لەدرێژیدا بەقەد یەك بن یان نا گرنگ نییە.

**ب- پەخشانی ڕەوان:** ئەم جۆرە پەخشانە بایەخ بە سەروای پارچەکانی ڕستە نادا، نووسینەکە بەشێوەیەکی ڕەوانو بێ گرێو گۆڵ دەڕوا. پەخشانی ڕەوان دەبێ لە تێگەیشتنی فراوانو خەیاڵێکی ئازادو داڕشتنێکی سفتو پتەووە هاتبێ، ئەگەرنا جێگای خۆی ناگرێ.

نموونەی پەخشانی ڕەوان وەکو شاکر فەتاح، لە (ژینی نوێ)دا دەڵێ:

(**جیهان بەرەو چاکی ئەڕوا:** لەگەڵ ئەم هەموو شەڕو شۆڕو بەدکردارییەشدا کە ئیمڕۆ لە جیهاندا ئەیبینین، من باوەڕم وایە کە جیهان بەرەو چاکی ئەڕواو دوایی هەر ئەگاتە ئەو ئامانجەی ئاواتی بۆ ئەخوازین، واتە ئەبێتە یەك خێزان لەناو یەك خانوودا، بەڵام خێزانێکی بەختیار لە خانوویەکی ناوازەدا...) (بۆ لەبەرکردنە)

ئەم پارچە نووسینە بە کوردییەکی پەتیو ڕەوان باسی لەناوچوونی شەڕو بەدکاریو سەقامگیر بوونی ئاشتیو ئاسایش دەکا. نووسینەکە وەکو ئاوی زولال بە نەرمو لووسی دەڕواو خوێنەر هەست بە هیچ گرانیو زبرییەك ناکا.

**٢. پەخشانی زانستیی:** ئەو پەخشانەیە کە بەشێوەیەکی بابەتی (موضوعی) باسی حەقیقەتەکانی زانست دەکا، هەر زانستێك: بیرکاری، فیزیا، کیمیا، جوگرافیا... هتد. زمانی ئەم جۆرە پەخشانە دوورە لە خوازەو دووبارەکردنەوەو هونەری ڕەوانبێژی تر. ئەم جۆرە پەخشانە ناکەوێتە ژێر کاریگەری هەستو سۆزی نووسەرو هەستو سۆزی خوێنەر نادوینیێ. بەبێ لایەنیو بە یارمەتی کۆمەڵە زاراوەیەکی تایبەتیەوە بە دەربڕینێکی ورد، زانست شی دەکاتەوە.

نموونەیەك بۆ پەخشانی زانستی وەکو مەحموود نوری قەرەداغی لە باسی کۆمپیوتەردا دەڵێ:

(مێشکی ئەلکترۆنی پێك هاتووە لە ژمارەیەکی گەلێ زۆر لە بەربەستەی (صمام) ئەلەکترۆنی یان ترانسستەرو لە پارچەی زۆر وردی ئەلەکتریك کە کۆمەڵ کۆمەڵ داڕێژراونو کۆکراونەتەوە. زمانی ئەم ئامێرە لە وشەی (بەڵێ – و – نەء) پتری نیە، بە مانای زانیاری ئەلەکتریك، تەزووی ئەلەکتریك (بڕوا)و (نەڕوا) و هیچ جۆرە ئامانجێك ناداتە دەست ئاگادارو سەرپەرشت نەکرێت...) (بۆ لەبەرکردنە)

لێرەدا، نووسەر بایەخی بەهەڵبژاردنی وشە نەداوە، زمانی خوازەییو ڕەوانبێژی بەکارنەهێناوە، تەنانەت هەوڵی نەداوە، ڕستەکانیشی

ئەوەندە تۆکمەو ڕێك بن، چونکە گەیاندنی زانیاری لەلای ئەو لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لێ دەگیرێ کە دەیتوانی هەر بەو وشانە ڕستەی ڕێكو پێکتر دروست بکاو ئەگەر نەختێ وشەکانی پاشو پێش بکردایە، هەندێ ڕستەی ڕەسەنتر دەردەچوون.

## هونەرەکان (ژانراکان)ی پەخشان:

هونەرەکانی ئەدەب، بە هەردوو شێوەی هەڵبەستو پەخشانەوە، لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ زۆر گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، لە گەشەسەندنی ئەدەبی جیهاندا، هەندێ هونەر شکلیان گۆڕاوە وەکو دراما کۆنەکان هەموو بە هەڵبەست نووسراون، کەچی ئێستا دراما بە پەخشان دەنووسرێ، یان هەندێ هونەر دەوریان بەسەر چووەو ئێستا پێیان نانووسرێ وەکو داستانی پاڵەوانێتیو دڵداری، هەندێکی تر تازە داهاتوونو تەمەنیان لە چەند سەدەیەك زیاتر نییە وەکو کورتە چیرۆكو کورتە ڕۆمانو ڕۆمان، جگە لەوەی ڕۆژنامەگەری زۆر هونەری تازەی هێنایە کایەوەو گەشەی پێدان وەکو وتاری ئەدەبیو بیری ڕاگوزاریو گاڵتەو گەپو... ئەمانە هەندێکن لەو هونەرانەی بە پەخشان نووسراون:

هەقایەت (بە هەموو جۆرەکانییەوە)، ئەفسانە، وتاری ئەدەبی، خوتبە، کورتە چیرۆك، کورتە ڕۆمان، ڕۆمان، شانۆگەری، ژیننامە، بیری ڕاگوزاری (خاطرة)، لێکۆڵینەوەو ڕەخنەی ئەدەبی، نامە، وتوویژ، گاڵتەوگەپ، پەندی پێشینان...

هەریەکە لەم هونەرانە، لەکورددیدا مێژووی پەیدابوونو گەشەسەندنی خۆی هەیە، هەر یەکە دەستوورو شێوازی نووسینی خۆی هەیەو هەر یەکە جۆری تایبەتی خۆی هەیە. لە شوێنی خۆیدا باسیان دەکرێ.

## سەرەتای سەرهەڵدانی پەخشانی کوردی:

لە کوردیشدا، لەو میراتە ئەدەبییەی بۆمان ماوەتەوە، هەڵبەست کۆنترەو پەخشان بە قەد ئەو کۆن نییە.

کۆنترین پەخشانی کوردی کە تا ئێستا دۆزرابێتەوەو لەبەر دەستدابێ کتێبەکەی عەلی تەرماخییە کە لەسالّی هەزاری کۆچیدا (١٥٩١– ١٥٩٢ز ) لە ژیاندا بووە. کتێبەکەی لەبارەی رێزمانی عەرەبیو فارسیو کوردییە.

کتێبەکە لەئەسڵدا دوو ناوی بۆ داندراوە:

- هذا کتاب عبارة علی ترەماخی
- هذا کتاب صرف لسان کردی

کتێبەکە پێشەکییەكو سیو یەك (فصل)ە. چواردە فەسلی پێشەوە لەبارەی رێزمانی عەرەبییەو شازدە فەسلەکەی دوای ئەو لەبارەی رێزمانی فارسییەو لە کۆتایی زۆربەی فەسلەکاندا هەمان بابەتی لە کوردیشدا باس کردووە. فەسلی کۆتایش بووە بە (خاتمة).

زمانی نووسینەوەی کتێبەکە کوردییەکی پڕ وشەو دەستەواژەی عەرەبییە. ئەو زمانەیە کە مەلاکانی کوردستان لە حوجرەکاندا دەرسی عیلمو شەرعیان پێ دەگوتەوە.

## ئەمەش نموونەیەك لە پەخشانی تەرەماخی:

- فەسل د. بەحسا فیعلا موزاریعدایە: د زمانێ کورمانجیدا پێنج سیغە بدەر دکەڤن، زێدە نابی وەکو نها: (دچی)، (دچە)، (دچن)، (دچم)، (دچین). ئەفعالێدمایی ژی لڤان قیاس بکە...)
- فەسل د بەحسا ئەمری حازریدایە: بزمانێ کرمانجی دیسانی پێنج سیغە د ئەمری حازریدا ژی دبە، مەسەلا وەکو نها: (بدە)، یانی موفرەدی موخاتەبە، چەموزەککەر چە موئەننەسە (بدن) یانی هون تەسنیەو جەمعا غایبان چەموزەککەر چە موئەننەس، (بدم) یانی ئەز کو موتەککەلیمی وەحدەمە، (بدەین) یانی ئەم کو موتەکەللیم مەعەلغەیرین، ئەم (بدەین).

دوای عەلی تەرەماخی، (عقیدة کردیة)ی مەولانا خالید دێ کە بە (ئاقیەی مەولانا) یان (ئاقیەی کوردی) ناسراوە. بێ گومان مێژووی بۆ پێش ١٨٢٦/١١/١٧ دەگەڕێتەوە کە مەولانا خالد لەو ڕۆژەدا کۆچی دوایی کردووە، ئاقیەکە باسی پێنج روکنی ئیسلامو شەش ئەسلی ئیمان دەکا. لەباسی (پردی قیامەت)دا دەڵێ:

(پردی قیامەت کە پردێکە لە موو باریکترە، لە تیغ تیژترە، بە ئەمری خودای تەعالا دەینێنە سەر پشتی جەهەننەمی، ئەمر دەکەنە هەموان بەسەریدا ڕابوورن، هەر کەسێ بەهەشتی بێ، هێندێك وەك بروسکە، هێندێك وەك با، هێندێك وەك ئەسپی لنگ بەسەریدا

ڕادەبوورن. هەر کەسێ جەهەننەمی بێ پێی هەڵدەخلیسکێ دەکەوێتە جەهەننەمەوە، خودای تەعالا وەهای پێ موقەددەرە هەر کەس لەدنیادا لەسەر ڕێگای شەریعەتدا چاتر ڕابوردبێ، لەسەر پردی قیامەتدا چاتر ڕادەبووریێ).

گرنگی ئەو بەرهەمە لەوەدایە یەکەمین هەنگاوە بۆ جێبەجێ کردنی داخوازی گیانیو کولتووری کۆمەڵی کوردەواری بەزمانی خۆی. هەندێ تێبینی لەسەر شێوازی بەرهەمەکە:

- ئەو بەرهەمە دەری دەخا، ئەوسا سلێمانی هێشتا زاری جێگرتووی خۆی نەبووە چونکە کە شاری سلێمانی دامەزرا خەڵکی زۆر ناوچەی خاوەن زاری جیا جیا هاتنە شارو هەر کەسە جۆری ئاخاوتنی خۆی هەبوو. دوای ماوەیەکی زۆر ئینجا ئەو زارە گەڵاڵە بوو کە ئێستا خەڵکی شار قسەی پێ دەکەن.
- هەندێ دیاردەی وشەسازی لەبەرهەمەکەدا هەن، جێگای لێ وردبوونەوەن، وەکو بەکارهێنانی (دە) لەجیاتی (ئە)ی کاری ڕانەبردوو. مانەوەی (ت) لەکۆتای کاری ڕانەبردوو بۆ کەسی سێیەمی تاك. بەکارهێنانی (دی) لەجیاتی (تر)ی ئێستای ناوچەی سلێمانی.
- هەندێ وشە هەن ئەوسا بەجۆرێکی تر بەکارهاتوون، وەکو: (بۆن) ئەوسا (بێن)بووە، (بچووك) ئەوسا (پچووك) بووە...

دوای ئەم دەقە پەخشانە، بەرهەمەکانی مەلا مەحمودی بایەزیدی دێن، کە لەساڵی ١٨٥٦و بەدواوە نووسیویەتی، بۆ نموونە وەکو:

- مەمو زین ١٨٥٦
- عاداتو ڕوسوماتنامەی تەوایفی ئەکرادیەو ئوسوولی نیزاماتی کرمانجی، ١٨٥٨– ١٨٥٩.
- جامع یی رسالیانو حکایەتان بزمانی کورمانجی ١٨٦٠.

(مەمو زین)ەکەی مەلا مەحموودی بایەزیدی کورت کردنەوەی (مەمو زینی)ی ئەحمەدی خانییەو بە پەخشانو بەزاری بایەزیدی نووسراوەتەوە. ئەمەش نموونەیەك لە دەقی چیرۆکەکە:

(دویٚ وەقتو زەمانێدا، لەوان کناران، عادەتەکی قەدیم بوو کو ساڵێ جارەکی، دوەقتێ نەورۆزێدا سەری ساڵ دکرن. ویٚ ڕۆژێ، ئەهلیو خەڵکی بارژێر حەموو، فەقیرو دەوڵەمەند، مەزنو بچووك، نێرو مێ، عوومومی، ژبۆ گەشتو گەڕییانێ، ب دەرڤە دچوونە دەشتو سەحرایێ. جنس جنسو ڕەف ڕەف، ژ دەرڤە ڕەسمی کەیفخۆشی نەورۆزێ ل ویٚ دەرێ ئیجرا دکرن، لەورا ویٚ زەمانێ قسمێ تایفا ژنێد موسڵمانان حەموو مەستوورەو ڤەشێرتی بوون، بەڕوویێ نا مەحرەمو بیانیان نەدکەتن. لاکن ڕۆژا کو ئەو عیدا نەورۆزێ دبوو، حیجابو پەردە ژتایفا ژنان ڕادبوو، مێروژن ویٚ ڕۆژێ بە هەڤ خویا دبوون...)

دوای ئـەم بەرهەمانـەو هـەر لەسـاڵی ١٨٦٠ شـێخ حوسـێنی قـازی مەولوودنامەکـەی خـۆی نووسـیوە کـە بەخـشانێکی سـەروادارو ڕەوانـەو بـەزاری کرمـانجی خـواروو (ناوچـەی سـلێمانی) نووسـراوە. ئەمـەش نمونەیەك لەو مەولوودنامەیە:

(حکایـەت کـراوە لـەزەمانی ئـەمیری ڕەشـید– هاروونـە ڕەشـید– لەشاری بەسرە جوانێك هەبوو پیسو پەلید، لە فاسیقیدا شاگردی ئـەوی بوو یەزید، چ چاکەی نەبوو لـەپاش ئیمـان، فەقـەت کـە مـانگی مـەولوود دادەهات غەسلو تۆبەی دەکرد تەماعێکی لێ دەنا دەیخوێنـد مـەولوودی حەزرەتی پێغەمبەری ئینسو جـان. وەختـێ کـەمرد لەبـەر خراپـی یـان فڕێیـان دایـە سـەر گووفـەکان، نـەیانبردە سـەرقەبران، بانگێـك هـات لـە ئاسمان، ئەی ئەهلی بەسرە حازر ببنە سـەر جـەنازەی فـلان جـوان، کـە وەلی‌یێکە لە ئـەولیای خوداوەنـدی ڕەحمـان. ئـەهلی شـار جـوانو پـیرو پادشاو دەروێشو گەداو فەقیر، حازری جەنازە بـوون دەفنیـان کـرد بـێ تـەئخیر. لـە خـەویان دیـت ئـەووەل شـەو لەسـەر تـەختی بەهەشـتی دانیشتییە ڕووی وەك مـانگ دەدا پڕقـەو، پێیـان وت ئـەتۆ لـە دونیـا زۆر فاسـق بـوویو ئەحمـەق، بەچـی سـەبەب شـادبووی بـەحوورو قوسـوورو لیباسی سوندوسو ئیستبرەق، گوتی بەسەبەبی تەعزیمی مەولوودی ئـەو حەزرەتەی کە بەئیشارەتی ئەنگوستی مانگی دەکرد شەق).

**ئەم مەولوودنامەیە لە رووی ناوەڕۆک و رووخسارەوە:**

١- چۆنیەتی دروست کرانی دونیا چونکە لە شەرافەتی پێغەمبەر دروست کراوە (لولاك لولاك لما خلقت الافلاك)

٢- هەندێ چیرۆکی کورتی تێدایە، گەورەیی و کاریگەری مەولوودی پێغەمبەر پێشان دەدەن و نموونەی سەرەوە یەکێکە لەو چیرۆکانە.

٣- باسی چۆنیەتی لە دایکبوونی پێغەمبەر دەکا.

٤- مەولوودنامەکە بە پەخشان نووسراوەو جاروبار پارچە شیعرێکی تێ هەڵکێش کراوە.

٥- زۆربەی هەرە زۆری بە پەخشانی سەروادار نووسراوە، بەزۆریش هەر جارەی کۆمەڵێ دەستەواژەو ڕستەی زۆر دەبن بەهاو سەروا.

٦- زمانەکەی پڕە لە وشەی فارسی و عەرەبی. هەر ئەو زمانەیە کە شاعیرانی سەدەی نۆزدەمی ناوچەی سلێمانی شیعریان پێ نووسیوە.

دوای ئەم بەرهەمانە کە پەخشان نووسراوەو لەبەرە بەری کۆتایی سەدەی نۆزدەم پەخشانی کوردی دەروویەکی زۆر گەورەی بۆ کرایەوەو لەوە بە دواوە بە فراوانی کەوتە بڵاوبوونەوەو نەشو نماکردن، ئەو دەرووەش لە ١٨٩٨/٤/٢٢ لە قاهیرەو لەلایەن **میقداد مەدحەت** بەدرخانەوە دەرچوو بۆ ماوەی چوارساڵ بەردەوام بوو. نموونەیەك لە پەخشانێکی ڕۆژنامەی کوردستان:

(وەك ئەز دبهسیم کوردا گەلەك دەولەمەند هەنە، گەلی دەولّەمەندێن کوردا، بابێن وە ب دوگاز جاوی سپی چوون بەر ڕەحما خودێ، ئـون ژی وی وەلی بچن لەوان زێرو زیڤێن عولبەکرین وەدە دەرێخن، ڕێیا خودێدە مەکتەبو مەدرەسا چێ کەن، زارویێن بێ دێو باب بدن خوندن دا ئـون دنیاو ئاخرەتی ڕاحەت بکن، خودێ ژ وە ڕازی ببە. دەرێن ئەز لێ گەڕابیم من گەلەك مرۆڤێن دەولّەمەند دیتنە زارویێن فەقیر دانە خوێندن ڕێکرنە ئەستانبولێ، مەکتەبو مەدرەسەیێن مەزن، نهۆ حەمی مەزن بینە، حەمی ژی مەئموورو زابتێن دەولەێینە...). (بۆ خوێندنەوە)

لەو ساوە تا ئێستا چی ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی دەرچووە، هەموو دەوریان لەپێش خستنی پەخشانی کوردیدا هەبووە، چونکە ڕۆژنامەگەری هەموو دونیا هەر پەخشانەو تەنیا جاروبار دەقی شیعری بڵاو دەکاتەوە ئەویش ڕێژەیەکی زۆر کەمە لەچاو هەموو نووسینەکانی دی. جگە لەوەی پەرەسەندنی زیاتری چاپو چاپەمەنی وای کرد پەخشان زیاتر گەشە بکاتو هەموو هونەرەکانی پەخشان بە کتێبیش بکەونە بەر دەستی خوێنەران... لەباسی ڕۆژنامەگەریدا، ڕۆڵی ڕۆژنامە لە گەشەسەندنی پەخشان ڕوونتر دەکرێتەوە، جۆرەکانی تری پەخشانیش وەکو وتارو چیرۆكو ڕۆمان... هەر یەکە لە شوێنی خۆیدا باسی لێ وەردەکرێ.

# هەندێ جۆری پەخشان

## ١. وتـار:

پارچە نووسـینێکە بـە پەخـشان دەنووسـرێ، درێژییەکـەی چەسپاو نییـە، دەشـێ یـەك دوو لاپـەڕە بـێو دەشـێ بیـست سـی لاپـەڕەبێ، بەشێوازێکی ڕوونو بەزمانێکی پاكو پاراو باسـی بابـەتێك دەکـاتو بـیرو باوەڕو هەستو سۆزی نووسەرەکەی دەردەبڕێ. لەهەموو جۆرە (ژانـرە) ئەدەبییەکانی دی نەرمو دەستەمۆترە، چۆنت بوێ وا دێتە دەست.

## کورتە مێژوویەکی وتار

ئەگەر چی ڕەگو سەرە داوو ڕەگەزەکانی نووسینی وتار زۆر کۆنە بۆ سەردەمی یۆنانەکان دەگەڕێتەوە، بەڵام بۆ یەکەم جار لە مێژوودا لەسەر دەسـتی مـۆنتێنی فرەنـسی (١٥٣٣– ١٥٩٢) یاسـاو بنـەماکانی گەڵاڵـە بوون، ئەو کاتەی کە سـاڵی (١٥٨٠) دوو بـەرگی وتـاری ئـەدەبی بـەناوی (هەولـەکان– les essaies) بڵاوکـردەوە، مـۆنتێنی وتارەکـانی درێـژبوونو دەگەیشتنە چەند هەزار وشـەیەك، بابەتـەکانی بـەزۆری بـە دەوری شـتی وەکـو: درۆزنـەکان، دەسـتووری جـلو بـەرگو هونـەری گفتوگـۆدا بـوو. لەدوای مۆنتێنی (باکۆن)ی ئینگلیزی لەژێر کاریگەری مۆنتێنی دا کۆمەڵە وتارێکی بڵاوکردەوە.

لـە سـەدەی حەڤدەهەمـدا، هەنـدێ نووسـەری وەکـو سـێر ویلیـەم کۆرنـوێلیرو نیکـولاس بریتـونو سـێرتۆماس ئۆڤـەربێری، لـەبواری وتـار

نووســیندا بەشــداری چــاکیان نوانــدو جــێ پەنجــەیان بــەڕەوتی وتــار نووسینەوە ئاشکرایە.

لە سەدەی هەژدەهەمدا، بەهۆی دەرچوونی بڵاوکراوەو چاپەمەنی، وتار زیاتر بەرەو پێش چوو، ریچارد ستایلو جۆزیف ئەدیسۆن داهێنـانی باشیان لە نووسینی وتاردا کرد.

لەسەدەی نۆزدەهەمدا وتار بناغەی پتەوترو خۆیشی گەشاوەتر بـوو، بابەتــەکانی فــراوانتر بــوونو وتــار نووســەکان زیــاتر بابــەتو شــێوازی خودییان پەیڕەو دەکرد، چـونکە سـەردەمەکە سـەردەمی برەوسـەندنی ڕێبازی ڕۆمانتیك بوو، دیارترینو وتارنووسی ئەم سـەدەیە (لامو هازلـتو دی کوینـسیو ستیڤنـسن) بـوون... ئـەوەی زیـاتر گەشـەی بـە وتـاردا دەرچـوونی گۆڤـارو ڕۆژنامــە بـوو، چـونکە جێگـای بڵاوبوونـەوەی وتـار بەزۆری گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوکراوەیە... لەسەدەی بیـستەمدا، وتـار هـەر لەچوونە پێشەوەدابوو و تا ئێستاش وتار نووسین نرخی خـۆی لەدەست نەداوە.

لــە کوردیـدا، نووسـینی وتـار لەگـەڵ بڵاوبوونـەوەی ڕۆژنامــە سـەری هەڵداو چەسپا، ئەگەر پێشتر ڕەگەزو بنەماکانی وتار لەهەنـدێ نووسـیندا هەشبووبێ بەو جۆرە نەبووە، ببێ بە ژانرێکی سەربەخۆ...

## جۆرەكانی وتار:

وتار بەشێوەیەكی گشتی دوو جۆرە:

١. وتاری خودی (ذاتی)

٢. وتاری بابەتی (موضوعی)

یەكەمیان زیاتر پەیوەندی بە خودی نووسەرەوە هەیەو هەستو سۆزی نووسەری بەسەردا زاڵەو كەسێتی نووسەرەكەی بەڕوونی پێوە دیارە، كەچی دووەمیان پێ لەسەر لایەنی بابەتی دادەگرێو هەوڵ دەدا ڕاستەقینەی چەسپاو باس بكات، بۆیە ڕێگە بەهەستو سۆزی خۆی نادا تێكەڵی نووسینەكەی ببێو، كەسێتی نووسەر لەم جۆرە وتارەدا دەرناكەوێ.

## هەندێ سیمای وتاری چاك:

١. وتار نووسینێكە، نەزۆر كورتەو نەزۆر درێژە، بەدەوری (١٠) لاپەڕە مەزەندە كراوە.

٢. باسێكی سەربەخۆیە، واتە نە لێكدانەوەی بیرێكی كورتو چڕەو نەكورت كرانەوەی باسێكی درێژە.

٣. وتار بینای تایبەتی خۆی هەیە. لە پێشەكیو چەند پەرەگرافێكو ئەنجام پێك دێ. بیری گشتی وتارەكە: بەپێی گرنگی، بەسەر پەرەگرافەكان دابەش دەبێ.

٤. وشەو ڕستەکانی ڕوونو پوختو بژاردەن، هەریەکە وەکو خشتی دیوار لەشوێنی خۆی هاتووە.

٥. ئامانجی سەرەکی بزواندنی هەستو سۆزی خوێنەرە...

٦. وتار ناونیشانی هەیەو دەبێ ناونیشانەکە لەگەڵ ناوەڕۆکەکەی بگونجێ.

## نموونەیەکی وتار:

وتارێك لە ژمارە (٩)ی ڕۆژنامەی (کوردستان) بەناوی (وڵات– وطن) بڵاوکراوەتەوە، نزیکەی سێ ستوونی داگرتووە. لە پێشەکیدا دەڵێ:

(وەتەن، ئانکو ولاتی مرۆ، جسمەك وەیە کوییێن ژ وی جسمی موتەئەسیر دبن خەلقێن وێ دەرێنە. دە وێجا هنگی مرۆیین وڵاتەکی خوێ قووەت بین هەوقاس ئاخو بەرێ وی ولاتی خوێ دبە. هنگی بابێ من ژکوردستانێ ڕابی ئەو مەئمورێن حکوومەت ڕێ دکە سەر گوندو باژارێن کوردستانێ وەك مارا، خونا خەلقێن کوردستانێ ڤەدخۆن...)

## لێکدانەوەی مانای وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| مرۆ | : | مرۆڤ |
| یێن | : | ئەوانەی |
| وێ دەرێ | : | ئەوێندەرێ، ئەوێ |
| هنگی | : | کاتێ کە |
| خوێ | : | خاوەن، خودان. |
| هەوقاس | : | ئەوەندە |
| ئاخ | : | خۆڵ، زەوی |
| بەر | : | بەروبووم |
| ڕابی | : | هەستا، ڕۆیشت |
| ڕێ دکە | : | دەچێتە |
| ڤەدخون | : | دەخۆنەوە |

ئەم وتارە بەکوردییەکی ڕەوان نووسراوە، ئەگەرچی جاروبار وشەی بیانیشی تێکەوتووە بەڵام داڕشتنەکەی ڕوونو ڕەوانە. ئەم وتارە هاندانە بۆ ئەوەی هاوولاتیانی کورد یەك بگرنو دژی داگیرکەر بجەنگن. جا ئەو داگیرکەرە چ عوسمانلی بێو چ مسقۆف (واتە ڕووس).

## ٢. كورتە چیرۆك

چیرۆك لە ئەدەبی جیهاندا ڕەگی زۆر کۆنەو لە قالبی هەقایەتی فۆلکلۆریو ئەفسانەو داستانو چیرۆکی گیاندارانـدا دەردەکەویّ، بەلام کورتە چیرۆك وەکو جۆر (ژانر)ێکی سەربەخۆ لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەسەردەستی (ئەگار ئالان پۆوگی دی مۆپاسانو چیخەف) قالبی هونەری خۆی وەرگرت.

### کورتە چیرۆك بەگشتی دوو جۆرە:

- چیرۆکی بنیاتگەریی (ترکیبی)
- چیرۆکی شیکاریی (تحلیلی)

هەریەکە لەم دوو جۆرە سیماو بنەمای تایبەتی خۆی هەیە، بەلام بەشێوەیەکی گشتی کورتە چیرۆك لەم ڕەگەزانە پێکدیّ: (کەس، کات، ڕووداو، شوێن) هەر یەکە لەم ڕەگەزانە مەرجو خاسیەتی تایبەتی هەیە بۆ ئەوەی چیرۆکەکە سەرکەوتووبیّ.

لە ئەدەبی کوردیش، وەکو ئەدەبی نەتەوەکانی دی، ڕەگەزی کورتە چیرۆك بۆ چیرۆکی میللیو ئەفسانەو داستان... دەچێتەوە، بەلام وەکو جۆرێکی ئەدەبی سەربەخۆ لەسەدەی بیستەم سەری هەڵداو نەشو نمای کرد.

ئەگەرچی بیروڕای جیا جیا هەیە، ئاخۆ یەکەم کورتە چیرۆکی کوردی کامەیەو کەی بلاّوبۆتەوە، بەلام بەزۆری تۆژەرەوان لەسەر ئەوە ڕێکن

کە یەکەم چیرۆك ئەوەی (فوئادی تەمۆیە) کە لەژمارە (٢-٣) ی گۆڤـاری ڕۆژی کورد (١٩١٣) لەژێر ناوی (شەویش)دا بڵاوکراوەتەوە.

**ئەمەش نموونەیەکە لەم چیرۆکە:**

(شەویش کوڕێ شڤانەکی یە، ب خوە دەهـ سالییە، زارۆکە، بەلێ پـڕ چاڤێ وی گرییە، شەویش دیـا خـوە نەدییـە، ڕەبـەنو بەلـەنگازە، قـەت تشتەکی وان تونینە. تنێ مەتەکی شەویش هەبوو، ئـەو ژی پـیرەك بـوو، شەویش جارنا بال وێ دچە، دلێ مەتا خوە هنك دکر...)

**لێکدانەوەی وشەکان:**

| | | |
|---|---|---|
| شڤان | : | شوان |
| ب خوە | : | خۆی |
| زارۆکە | : | منداڵە |
| بەلێ | : | بەڵام |
| چاڤ | : | چاو |
| گری | : | گریان |
| دی | : | دایك، دیاخوە: دایکی خۆی |
| نەدییە | : | نەدیتیە، نەدیوە. |
| ڕەبەن | : | بێکەسو کار |
| بەلەنگاز | : | هەژارو نەدار |
| تونینە | : | هیچ نییە |

| | | |
|---|---|---|
| تنیٚ | : | تەنیا |
| مەت | : | پوور، خوشکی باوك |
| ئەوژی | : | ئەویش |
| جارنا | : | جاروبار، هەندیٚ جار |
| یا ل ویٚ | : | لای ئەو (لای پووری) |
| هنك | : | فیٚنك، خۆش |

ئەم چیرۆکە ویٚنەی ژیانی کویٚرەوەری شوانیٚکی کورد دەخاتە بەرچاو کە لەباوکیٚکی پیرو منداڵیٚکی دەساڵانە پیٚك هاتووە ناوی (شەویش)ە.

ڕۆژیٚکیان باوکە پیرەی نەخۆش دەکەویٚو ناتوانیٚ بچیٚتە بەر مەڕی، ڕدیٚن سپییەکی گوند، بە نەخۆشیەکەی دەزانیٚ، دیٚ (شەویش) دەباتە ماڵی خۆیان، خواردنی دەداتیٚو هەندیٚ خواردنیش بۆ باوکی شەویش دەنیٚریٚو ڕزقۆی کوڕی خۆی ڕادەسپیٚریٚ لەباتی باوکی شەویش بچیٚتە بەر مەڕ تا لەنەخۆشیەکەی چاك دەبیٚتەوە.

ئەم چیرۆکە بە دوو حەلقە بڵاوکراوەتەوەو لەکۆتاییدا نوسراوە (داوی هەیە- ماویەتی).

لەژمارە سیٚدا چیرۆکیٚکی دی بەناوی (کندو) بڵاوکراوەتەوە، ئەمە زیاتر چیرۆکیٚکی میللییەو لەناو خەڵکدا باوە، زۆر لەچیرۆکیٚکی مەحموودی بایەزیدی دەکات. دوور نییە هەر ئەوبیٚو دارِژابیٚتەوە.

دوای ئەمــە چــیرۆکی (لەخــەوما)ی جــەمیل ســائیب دێ، کــە لــە (١٩٢٥)ەوە بــەزنجیرە لــە ڕۆژنامــەی (ژیانــەوە)دا بــڵاوی کــردەوە. ئــەم چیرۆکە هەمووی ڕەخنەیە لە فەرمانڕەوایی شێخ مەحموود.

## ٣. شانۆگەری

شانۆگەری بەرهەمێکی درامییە (کردەنییە) بۆ ئەوە نووسراوە لەسەر شــانۆ پێــشکەش بکــرێ، ئەکتــەر دەوری کەســەکانی شــانۆگەرییەکە دەگێڕن.

کــۆنترین شــانۆگەری لای یۆنانــەکان بــووە کــە لــە بۆنــە ئاینییەکانــدا پێــشکەشیان کــردووە شــانۆگەری ئەوســا بــە شــیعر بــووەو لــە شــانۆی کــراوەی نیمــچە بازنەییــدا پێــشان دراوە. دوای یۆنانــەکان ڕۆمانــەکان پەرەیان پێداو لە چاخەکانی ناوەڕاستیش زمانی لاتینی بەسەر نووسیندا زاڵ بــوو و شــانۆگەری خرایــە خزمــەت بیروبــاوەڕی ئــایینی. لەســەدەی شازدەمو حەڤدەمدا لە ئینگلتەرە شەکسپیرو هەر لەسەدەی حەڤدەمدا کورنێو مۆلییێرو راسین لە فەرەنسا گەشەیان بە شانۆگەریدا لەسەدەی هەژدەمو نۆزدەم ئینجا بیستەمدا جۆرە ڕێبــازی جیــا جیــا لــە نووســینو پێشکەشکردنی درامادا سەری هەڵدا لە کوردیدا، جگــە لــەوەی ڕەگــەزی دراما لە زۆر یاری میللی ناو کوردەواری هەیە وەکو مــیرو ئاشــەوان، ئاغــا ئاغایــانێو هتــد... یەکــەم درامــای کــوردی ئەوەیــە کــە عەبــدە ڕەحیمــی ڕەحمــی هــەکاری (١٨٩٠– ١٩٥٨) بــەناوی مــەمی ئــالان نووســیویەتیو لەژمارە (١٥)ی گۆڤاری (ژین)ی ساڵی ١٩١٩ بڵاوکراوەتەوە.

## نموونەیەك لەشانۆگەرییەکە

(مەمۆ: بەڵێ... ئیرۆکە میر عەمر کرییە غەزایە، نەیاران سەر حەد گرتنە، زاریێ کوردان مەعازەللاهـ دێ دبەر دەستو پێیێن دژمنان بچت... ئەز ژی کێمترم! ما ئەز کورمانج نیم! ما نامووسا هەر کوردەکێ نامووسا من نیینە! ئەلبەت، ئەلبەت ئەزێ بچم قیامەت ڕابت دیسا ئەز دچم، خوین سەران ببت دیسا ئەز خوە ناگرم. هەتتا خەزال ژی من مانع بکەت دیسا ئەز ناوەستم. ئەز مەمێ ئالانم. میرێ هەکارییان ئەمر کرییە...)

(تەنها بۆ خوێندنە)

## لێکدانەوەی وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| ئیرۆکە | : | ئەمڕۆکە، ئەمڕۆ، ئیرۆ |
| عەمر | : | ئەمر، فەرمان |
| غەزا | : | چوونە شەڕی کافران |
| نەیار | : | دوژمن |
| سەرحەد | : | سەرسنوور، سەرتخووب |
| زاری | : | زارۆ، منداڵ |
| مەعازەللاهـ | : | پەنا بەخوا |
| ئەلبەت | : | بێ گومان |
| ڕابت | : | هەڵبسێ |
| خوەناگرم | : | خۆم دوا ناخەم |
| مانیع بکەت | : | ڕێ بگرێ، لێ نەگەڕێ. |

هەر چەندە پاڵەوانی ئەم چیرۆکە ناوی (مەمی ئالان)ە، بەڵام هیچ پەیوەندی بەداستانی مەمی ئالانی ناو کوردەوارییەوە نییەو وەکو هەر ناوێکی تر بۆ پاڵەوانی شانۆگەرییەکە داندراوە.

شانۆگەرییەکە بیری نەتەوەیی‌و ئایینی پێکەوە گرێ داوەو هەڵوێستێکی پڕ سۆزی لە کۆتاییدا نواندووە کە لە ئەدەبی بیهودەیی (عبث) کامۆی فرەنسی نزیك دەبێتەوە.

مەمی ئالان گەنجێکە تازە ژنی هێناوە (خەزال)و پیرە دایکێکی هەیە کە جاڕی شەڕی قڕالی کافران دەدرێ‌و سەلاحەدینی ئەیووبی بەرەو ڕووی خاچ پەرستان دەبێتەوە، مەمی ئالان بەدوای جاڕەکەدا دەچێ‌و دوای ساڵێك دەگەڕێتەوەو لەگەڵ خەزالی ژنی باوەش بەیەکدا دەکەن‌و ڕادەکشێن‌و خەو دەیانباتەوەو ئەو دەمە دایکی لەماڵ نابێ کە ئەو دێتەوە، پاشان دایکی بەسەردا دێتەوەو دەبینێ پیاوێك لەگەڵ خەزالی بووکی ڕاکشاوە، ئەویش یەك ڕمی لێ دەداو دەیکوژێ‌و خەزال بە ئاگادێ‌و هاوار دەکا (تە چاڤێ خوە کۆرکر)...

ئەم کۆتاییە دڵتەزێنە لە چیرۆکی (مەمۆ)ی فۆلکۆریدا هەیەو شانۆگەری (تێك نەگەیشتن)ی کامۆی فرەنسی لەسەر هەمان بنەما هاتووە.

# کـــوردی پـەتـی

زمـــانی کـــوردی، هـــەر لەســـەرەتای نووســـینیەوە، کـــەوتبووە ژێـــر کاریگەری زمانی دراوسێکانیو بەتایبـەتیش زمـانی عـەرەبی، بەهـەزاران وشـــەو دەســـتەواژەی عـــەرەبی لـــەکوردی بـــەکاردەهاتن وای لێ هـــاتبوو زۆرجار تەنیا دارشتنی رێزمانی رستە بە کوردی دەمایەوە، دەنـا هـەموو وشـــەکان عـــەرەبی بـــوون... ئەگـــەر چـــاوێکی خێـــرا بـــە نووســـینەکانی رۆژنامـەی (کوردسـتان)و (رۆژی کـورد)و (رۆژی کوردسـتان)و... بگێـرین ئەم راستییەمان بۆ دەردەکەوێ.

میجەرسۆن، کەدوای هاتنی ئینگلیز بـۆ عێـراقو کوردسـتان، خـاوەن دەسەلاتێکی زۆربوو، سەرەتا لە بەغـدا رۆژنامـەی (تێگەیـشتنی راسـتی) دەرکـــردو پاشـــان لـــە ســـلێمانی رۆژنامـــەی (پێـــشکەوتن)ی دەرکـــرد (١٩٢٠– ١٩٢٢) سۆن جگە لەوەی کە خۆی کوردییـەکی باشـی دەزانـیو زۆر بەرهـــەمی راســـتەوخۆ لـــە ئینگلیزییـــەوە کـــردووە بـــە کـــوردیو لـــە پێشکەوتندا بلاوی کردۆتەوە، هەوڵی دەدا زمانی کوردی لە وشەی بیانی پاك بکاتەوە. بـۆ ئـەم مەبەسـتە نووسـەرانی هـان دەدا بـەکوردی پـەتی بنووسـنو پێـشبڕکێیەکی ئەنجامـدا سـێ کـەس خەلاتەکـەیان بـردەوە: یەکەم: شێخ نووری شێخ سالح بە شیعری (جووتو گـا شـتێکی چـاکە)، دووەم زەکی سائیب بە پەخشانی (بۆ چـرووك)و سـێیەم: جـەمیل سـائیب بە پەخشانی (رۆژەوە بوونێك)، هەرسێکیان لەژمارەی (٣٠) پێشکەوتندا بلاوکراونەتەوە.

## ئەمەش نموونەیەکە لە(بۆ چرووك)ی زەکی سائیب

(هەچ وەختێ ئەم قامیشە دوو لەتە، ئەم ئاسنە دوو کەرتە ئەگرم بەدەستەوە، زمانم توێ توێ ئەبێ. خوێنی دڵ، ئەو دڵۆپە سوورانە لە هەموو شارەگی لەشمەوە کۆ ئەبێتەوەو ئەتکێ حەوزێکی سوور دەخاتە بەر چاوم، تنۆك تنۆك لە چاومەوە فرمێسك ئەڕژێو لەبەر پێما بیرێك پەیدا ئەبێ سەرم وەکو مزراحێکی دگ دگە بەگوڕ دایکوتی، گێژو سوورِ ئەخواو لەبنیا ئەمێنێتەوە. ئەو هەنسکانەی لە بنکی دڵەوە هەڵئەکشێ لە گەرووما کۆ دەبێتەوە، هەناسەم لێ دەبڕێ، دەمەوێ نەختێ لەم کاسە لێو ڕێژەی دڵم بڕێژمو سووك کەم...) (بۆ خوێندنەوە)

دیارە ئەم وتارە بەکوردییەکی پەتی نووسراوە، وشەی بیانی زۆر کەم تێدایە، ڕستەکانی ڕێكو ڕەوانن، دارِشتنی پوختەو بێ گرێیە. ناوەڕۆکەکەشی بابەتێکی خودییە... نووسەر باسی باری دەروونی خۆی دەکاتو دەیەوێ بۆ کرووزو بۆ چروو دڵەی سووتاوی بە گەرووی شمشاڵ دەردەبڕێ.

( ٢ )

حسێن حوزنی موکریانی، کە زمانزان‌و دیرۆکنووس‌و هونەرمەندێکی گەورەی کورد بووە، لەساڵی ١٩١٥ لە حەلەب چاپخانەیەکی کڕی‌و ساڵی ١٩٢٦ هێنایە ڕواندز دەستی بە بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردی کردو ڕۆژنامەی (زاری کرمانجی)یشی دەرکرد کە لەماوەی ٩٢٦– ٩٣٢، (٢٤) ژمارەی لێ دەرچوو. لەژمارە (٥)ی ساڵی دووەمدا (١٩٢٨) وتارێکی بڵاوکردۆتەوە بەناوی (دەوری ئیستیعباد) (ل٨– ١٥)، باسی زولم‌و زۆرو کوشتاری (محەمەدی قاجار) دەکا دژی گەلی کوردو نەبەردیی کورد پێشان دەدا لەبەرگری کردنی دەستدرێژییەکانی محەمەد ئاغا.. ئەمەش نموونەیەکە لەو نووسینە: (لە کوردەکانی تاڵش، سێ کەس دەستیان هاوێژتە خەنجەری پیاوەتی، لەشەوی شەممە، بیست‌و یەکەمی زیلحیجە، ساڵی ١٢١٢دا، نزیك بە سپییدە، لەناو چادردا چوونە سەر ئاغا محەمەد بە خەنجەران پارچەیان کردو سندووقی پڕ گەوهەرو بازوو بەندو شیری گەوهەر بەنو دەریای نوورو تاجی ماه و گەلێك چتی بەنرخ، کە ئاغا محەمەد لە حکوومەتی کوردەکانی زەندی دەست کەوتبوو، هەموویان هەڵگرت‌و چوونە کن سادق خانی شقاق، ئەو سێ کوردانە تۆڵەی کوردەکانی تاڵش‌و زەندیان لە ئاغا محەمەد کردەوە...).

(تەنها بۆ خوێندنە)

# سەيید یاقوبی ماهیدەشتی

## ژیانی:

سەیید یاقوبی ماهیدەشتی ناسراو بە (سەی یاقۆ) یەکێکە ژ هۆزانڤانێن کورد کو هۆزانی بەشێوە زاری کوردی لوڕی ڤەهاندییەو سەرەرای ئەڤ شێوە زارەش، هۆنراوەی بە موکریو هەورامی داناوە. هەر چەندە تانهۆژی سالّی لەدایکبوونو مردنی بە تەواوی ڕوونو ئاشکرانییە، بەلاّم زۆرتری سەرچاوە ئەدەبییەکان بۆ هەندێ دەچن کە ناوبراو لە سالّی ١٢٢٩ی کۆچی کە دەکاتە بەرامبەر سالاّنی ١٨١٢– ١٨١٣ز لە گوندی (قەمەشە)ی مایدەشتدا لەدایکبووەو هەر لە منداڵییەوە خراوەتە بەر خوێندنی ئەو کاتەو سەرەتا هەردوو زمانی فارسیو عەرەبی فێربووە، ئنجا هەر بۆ خوێندن ڕووی کردووەتە کرماشان، هەر بەمەستی خوێندن سەری لە گەلەك شوێنو دەڤەر داوەو تا لەپاشان بووە بە (میرزا)و نووسەر لای حەسەن خانی فەرمانڕەوای کەلهوڕ، لای ئەودا دەمێنێتەوە تا لەسالّی ١٢٩٢ی کۆچی کە دەکاتە هەڤبەر سالاّنی ١٨٧٤– ١٨٧٥ز، کۆچی دوایی دەکاتو تەرمێ وی لە گوندی قەمەشە دهێتە قەشارتن. دیوانەکەی نزیکەی (٢٠) هەزار دێرە هۆنراوە بووە تیا چووەو نەماوە، ئەوەی ماوەو بەدەست گەیشتووە دەوری هەزار دێرێکە.

## ناوەڕۆکی هۆنراوەکانی:

وەك زۆرینەی هۆزانڤانە کلاسیزمەکانی ڕۆژهەلات، سیفەتە زاڵەکان بەسەر هۆنراوەکانی سەیید یاقوبدا خۆیان لەم چەند تەوەرەیەدا دەبیننەوە:

١. تەوەرەی هۆنراوەی دڵداریو خۆشەویستی، کە دیارە کاریگەرییەتی سەعدی شیرازی فارسو مەلا خدری نالی کورد بەسەریدا لەم بوارەی هۆنراوەدا تا ڕادەیەکی زۆر دیارەو، ئەو دڵدارییەی کە سەیید یاقۆ باسی لێوە دەکات زیاتر بەر گۆشە نیگای دڵدارییەکی ئاسمانی دەکەوێت بەلای تەسەووفو خواپەرستییەوە بادەداتەوە، بەشێکی زۆری ئەو هۆنراوانەی کە بەدەستمان گەیشتوونو لە فەوتان ڕزگارییان بووە، هۆنراوەی دڵدارین، نموونەشیان ئەم چەند دێڕەیە:

| | |
|---|---|
| **(١) گا پەروانەی دەور شەم جەماڵانی** | **گا هامرازی راز کەمەر لالانی** |
| **(٢) گەهێ سکووتی گەهێ نالانی** | **گا چون ئەودالان وێڵی ماڵانی** |
| **(٣) من هەر دەواکەم تۆ هەر زامەنی** | **تۆ تاکەی نەفکر سەودای خامەنی** |

**(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)**

٢. تەوەرەی هۆنراوەی وەسفی دیمەنی سروشتی، تەوەرەیەکی دی ناوەڕۆکی هۆنراوەکانییەتی کە دیارە جوانی سروشتو دیمەنە جوانەکانی بەهار سەرچاوەیەکی ئیلهام بەخشی هۆزان بووە لای ئەو، بۆیە کە دێتە سەرباسی بەهارو دیمەنی سروشتی وەستایانە باس لە جۆری گوڵو گوڵزاری بەهاری کوردستان دەکاتو دەڵێت:

١. ئەرخـــەوانو نـــەرگسو نەســـرینو یـــاسو یاســـەمەن
سۆســـەنو لاولاو ولیلـــو لالـــە هـــایی ئەحمـــەدی

٢. کـــاجو شمـــشادو ســـنەوبەر عەرعـــەرو ســـەرو وســـەهی
ســـەر فـــرازان قـــەد کەشـــیدە تـــا وە چـــەرخ داوەری

٣. فەسڵی عەیشو فەسڵی نۆشو دڵ بە جۆشو غەم خەمۆش
بـــادە نـــۆشو دەس نـــەدۆشو ماهڕوویـــانی پـــەری

٤. فەسڵی گوڵ، فەسڵی رەیاحین، فەسڵی سونبول، فەسڵی عشق
ئـــەم بـــەهار لالـــەزارو ئـــەم شـــەرابی کەوســـەری

(لە سەرەتاوە سێ دێر بۆ لەبەرکردنە)

٣. ئنجـا تەوەرەیـەکی تـری هـۆنراو لای سـەیید یـاقۆ، تـەوەرەی هۆنراوەی ئاینییە، لەو جۆرە هۆنراوەیەشدا ئەسپی خـۆی تـاوداوەو شارەزایانە مەلەوانیی تیادا کردووە.

هـەر لـەم بوارەدا ئەگـەر بەچـاوێکی پـسپۆڕانە هۆنراوەکـانی سـەیید یاقوب بخوێنینەوە دەبینین وەکو مرۆڤێکی شارەزا لە ئەدەبی فۆلکلۆری نەتەوەکەی زۆرجـار پـەنا دەباتـە بـەر بـەکارهێنانو سـوود وەرگـرتن لـە پەنـدی پێـشینان، بـۆ ئـەوەی هۆنراوەکـانی پـێ بڕازێنێـەوەو جـۆرە

پتەوییەك بە ناوەڕۆكی هۆنراوەكانی بدات. بەكارهێنانی پەندی پێشینان لەلایەن ئەم هۆنەرەوە نیشانەی پلەو پایەی شارەزاییەتی لە ئەدەبی فۆلكلۆری كوردیدا. بۆ نموونە لەم دێڕە هۆنراوەدا:

رای ڕوواو ئەنجیر كەردەنی وەپیش
باوە توو گورگی های نە چەڵدەمیش

(بۆ لەبەركردنە)

ئاماژە بە پەندێكی پێشینانی كوردی دەكات كە بەشێوەی لوڕی بەم جۆرەیە: ((ڕووا دەمی وە دار ئەنجیر نارەس، ئوشێت خراوە))
واتـــە: ((ڕێوی دەمی بەدار هەنجیر ناگات دەڵێ خراپە ))
واتای دێڕە هۆنراوەكەش ئەوەیە: ((تۆ ڕێی ڕێویو هەنجیرت گرتۆتە پێش (كردووتە بەپیشە)، بابە تۆ گورگی بەڵام وای لە پێستی مەڕ دای)).

## ڕووخساری هۆنراوەكانی

لەپێشدا گوتمان كە سەیید یاقوب وەكو هەر هۆنەرێكی ئەو سەردەمانە، لەهۆنراوەكانیدا بێ ئەوەی پێ بزانێت ڕێچكەی ڕێبازی كلاسیزمی گرتۆتە بەر، تەنانەت ڕێبازی هۆنراوەكانی لەگەڵ ڕێبازە كلاسیزمەكەی ڕۆژهەڵاتدا دەگونجێت چونكە:

١. لەهۆنراوەكانیدا زمانێكی كوردی تێكەڵ بە وشەی عەرەبیو فارسی بەكارهێناوە، كە دیارە پێی وابووە ئەم كارە جۆرە ڕازانەوەو

جوانییەك بە ڕووخسارو سیمای هۆنراوەکانی دەبەخشێت، بۆ نموونە:

٢. بەشێکی زۆری هۆنراوەکانی بەسەر کێشی (عەرووز) دانراون کە هۆنەرانی عەرەبو فارسیش بەکاریان هێناوە، زیاتریش بیر بۆ ئەوە دەچێت کە ئەمەی لەژێر کاریگەرییەتی هۆنراوەکانی مەلا خدری نالیدا ١٨٠٠– ١٨٧٣ز کردبێت، چونکە شەیدای هۆنراوەکانی ئەو بووە.

١. هەر لەبەر ئەوەی کەوتووەتە ژێر کاریگەرییەتی هۆنراوەی هەورامی، بۆیە دەبینین ژمارەیەك لە هۆنراوەکانی بە کێشی (پەنجە– بڕگە) داناوە، جگە لەوەش هەتا لەجۆری دارشتنی هۆنراوەکانیداو لەجۆری ئەو پەیڤ ووشانەی بەکاری هێناوە بەلای هۆزانڤانانی گۆران (هەورامی)دا دەچێت وەك:

**زاهد حەرامەن، زاهد حەرامەن**
**زاهد زیندەگی وەتوو حەرامەن**

**نەشوورت وەسەر نەپات وە دامەن**
**نە هەرگیز مەجلس عەیشت مەقامەن**

**تەماشای ئەبرۆی خەم نەکردنی**
**ژەو خەمو قامەت چەم نەکردنی**

(بۆ لەبەرکردنە)

٤. بەگشتی ئەگەر سەیری ڕووخساری هۆنراوەکانی بکەینو تیایاندا وردبینەوە دەبینین، بەشی هەرە زۆریان هۆنراوەی ناسکو پاراون، بە

زمانێکی سادەو بێ گرێ، دایناون کە ئەمەش یەکێکە لە سیما دیارەکانی هۆنراوەی سەیید یاقوب، دیارە سەیید یاقوبیش، وەکو هەر هۆنەرێکی کورد لەو سەردەمانەدا کەوتووەتە بەر کاریگەرییەتی چەند هۆکارێك کە ماوەیان بۆ رەخساندووەو بواریشیان بۆ خۆش کردووە تا رێچکەی هۆنراوە دانان بگرێتو ببێ بە هۆنەر، هەندێ لەو هۆکارانە هاوبەشنو کاریگەرییان بەسەر هەموو هۆنەرانەوە هەبووە، هەندێکیشیان تایبەتن بەخۆی، بۆیە بەتێکڕایی دەتوانین ئەو هۆکارانە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کۆ بکەینەوە:

١. خوێندنەوەی شاکارەکانی شاعیری بەناوبانگی فارسی زمان (سەعدی) شیرازی ئەو شاکارانەش (گوڵستان)و (بووستان) بوون.
٢. کارتێکردنی هەندەك هۆزانڤانانی کورد وەك (ئەلماس خانی کەلهوڕ)و (خانای قوبادی)و (نالی)و (سالم)، تەنانەت ئەوەندە شەیدای هۆنراوەکانی (نالی)بووە هاتووە، ژمارەیەکی زۆر هۆنراوەکانی لە هۆزانڤانانی کەڵهوڕو موکری وەرگرتووە (نموونە ل٥).
٣. وەکو زۆربەی هۆنەرو هۆزانڤانانی پێش خۆیو سەردەمی خۆشی، گێرۆدەی داوی دۆستو خۆشەویستەکەی بووەو ئەم هۆکارەش کانیاوی هۆنراوەیان لەلا تەقاندۆتەوە.

ئەمەش نموونەیێکە لەو هۆنراوانەی کە لەژێر کاریگەرییەتی هۆنراوەی نالیدا دایناوە:

١. شــووریٚ وه ســـەرم كەوتییـــە لـــەم مەســـتی چـــاوه
هـــیچ جێگـــە نەنیـــشم مەگـــەر ئـــەوجی كـــە شـــەراوه

٢. ئـــەم زولـــفو روخـــی دولبـــەره؟ یـــا لـــەیلو نـــەهاره؟
یـــا هـــــەوری ڕەشو پەردەگەشـــــی بـــــانی هـــــەتاوه

٣. ڕووخساری توو وەك مانگو دوو زولفت وەكو عـەقرەو
هـەر چـەن كـە قەمـەر عـەقرەوە، ڕازیـم بـە قـەزاوە

٤. ســـــۆزی دڵمــــە باعـــــسی تــــاوو كــــوڵی گریــــان
مەعلوومــــە كــــە ئــــاگر ســــەبەبی جۆشــــشی ئــــاوه

(لە سەرەتاوە سێ دێر بۆ لەبەركردنە)

## لێكدانەوەی پەیڤان

١. شۆریٚ وەسەرم كەوتییە : شۆرێك كەوتیتە سەرم
هیچ جێگە نەنیشم : هیچ جیٚ نییە تیایدا دانیشم
واتا : شۆرێكی وان كەوتیتە سەر لەبەر مەستی ئـەم چـاوانە، هـیچ جهـ و شـوێنێك نییـە كـە تیایـدا دانیـشم، تـەنیا ئـەو جێگەیە نەبیٚ كە وێنەی چاوی دۆستەكەمی تێدا كێشراوەو ئەوی تێدا هەیە.

٢. روخ : ڕوو، دەمو چاو

پەردەکەشی : پەردەی کێشاوە (کێشایە)

بانی : بەسەر

واتا : ئەمە زولفو ڕووی خۆشەویستەکەمە؟ یان ئەمە شەوو ڕۆژە، لێرەدا زولفی لەڕەشیدا بە شەوو ڕووی لە گەشاوەییدا بەڕۆژ چواندووە یا ئەمە هەوری تاریو ڕەشە کە وەکو پەردە خۆی بەسەر (هەتاو)دا داوە لێرەشدا زولفی بە هەوری ڕەشو ڕووی بە (هەتاو) چواندووە.

٣. ڕووخساری توو : ڕووی تۆ، ڕوویێ تە

عەقرەو : دووپشك، عەقرەب

ڕووی تۆ لە جوانیدا وەکو مانگەو هەردوو زولفەکەشت لەوەدا کە لاربووینەوە وەکو دووپشك وان، هەر چەندە کە مانگ بەدەست دووپشکەوە گیری خواردووە، بەڵام ئەم قەزایەو بووە وا هاتووە.

٤. سۆز : شۆڕشو سووتان، سۆتن.

باعسی : هۆکاریو سەبەبی.

تاوو کوڵ : بەخوڕ، بەلێزمەو بەتاو

جۆشش : کولان، کەلین.

شۆڕشو سووتانی دڵمە بوویتە هۆی ئەوە کە بارانی فرمێسکی گریانەکەم بەگەرمی دەڕژێ، ئەمە شتێکی ڕاستە کە ئاگر هۆی کوڵانو جۆششی ئاوە، ئەگەر ئاگری عەشقی تۆ نەبێ فرمێسکم بەو جۆرە نارژێتە خوارەوە.

# عــەلی حــەریــری

عـەلی حـەریری ئێکـە ژ هۆزانڤـانێن کلاسـیزمی یـێن کـورد نـاڤێ وی (عەلی)یە ب ناڤێ گوندێ وی (حەریر) جهێ ژ دایك بوونێ ب ناڤ کرییە.

(حـەریر) گوندەکـە ل ناحیـا (شـەمزدینایە) یـاکو دکەڤیتـە دەڤـەرا (هەکاری)یا.

ناڤ و دەنگێن دەست هەلیو هۆستاییو ئێخستنە بـەرێكو سـەنگاندنێ ب ئاوازەکێ خۆشو دلڤەکەر د کوردستانێدا ناڤدار بوویە.

عـەلی حـەریری خوێنـدکارێ جهـێ هـەکاریان بوویـە. زانـاو رۆشـنبیر بوویە، مێژوو نووسـێ کـورد (شـەرەفخانێ بەدلیـسی) د (شـەرەفنامێ)دا خوێندکارێن هـەکاری یـا ب سـەر خوێنـدکارێن کـورد ئێخـستییە. پەسـنا زیرەکیو جوامێرییا وان کرییە.

هەروەسـا شـاعیرێ کـوردێ ب نـاڤ و دەنـگ (حـاجی قـادرێ کـۆیی) گـەورەییو شـاعیرییا عـەلی حـەریری دەردئێخیـت، چـونکە ل پـالێ وان شاعیراندا یـێ کـو باسـێ وان دکـەت نـاڤێ عـەلی حـەریری پ ڤـی جـۆری دهێنیت دەمی دبێژیت:

**ئــەوی جــامی گوتوویــەتی ئەمەیــە**

**لــەو قــسەو مەدحــە مەقــسەد ئەمەیــە**

**پــیرە مــەردێ بدیــدە ئــەم ز جــەزیر**

**نیــك مــەردێ بدیــدە ئــەم ز حــەریر**

حاجی دبێژیت مەبەستا (جامی) ژوێ دێری (عەلی حەریری)یە دەمێ دبێژیت: من پیرە میرەك دیت خەلكی جزیرێیەو پیاوەكێ چاك دیت خەلكی حەریرێیە.

دگەلەك سەرچاوەیێن ئەدەبیاتی كوردیدا وەسا لێك دەدەن كو مەبەست پێ (مەلا جزیری)و (عەلی حەریری)یە.

ژ دایك بوون‌و مرنا عەلی حەریری تا ئێستا ڕوهن‌و ئاشكرا نەبوویە هەر سەرچاوەیەك ب هۆزانڤانێ سەدەیەكی دادەنێت.

لێ یادیارو ئاشكرا، عەلی حەریری پێش ئەحمەدێ خانی یێ ژیای چونكە خانی د كتێبا (مەم‌و زین)ێدا ناڤێ حەریری ب یێ (مری)و ئینیت دەمێ دبێژیت:

**من دی عەلەما كەلامێ مەوزوون**

**عالی بكرا ل بانێ گەردوون**

**بینافە ڕوحا مەلێ جزیری**

**پێ حەی بكرا عەلی حەریری**

**كەیفەك وە بدا فەقێ تەیران**

**حەتا ب ئەبەد بمایە حەیران**

واتە: ((ئەز دا ئالایێ هۆزانێ‌و تۆرێ كوردی ل هەرچوار ڕەخێن جیهانێ بەرزكەم. گیانێ مەلای جزیری زیندوو كەمەڤە، دا عەلی حەریری ب گیان ئێخم. ب زیندووكرنا جزیری‌و ب جان ئێخستنا حەریری ب ڕادەكێ وەسا فەقێ تەیران دلگەش‌و بەختیاركەم تاكو هەتا هەتایێ ئەو دلگەش‌و شادمان مابا)).

چەرخێ ژینا عەلی حەریری ب دروستی ڕوهن‌و ئاشکرا نەبوویە، دتارییا نەزانینێ دایە. تنێ ئەو تشتێ نهۆ ددەستدا دێرە شیعری (پێ مەی بکرا عەلی حەریری)یا خانییەو یاکو ناڤێ وی پشتی جزیری ئینایە. جزیری ل سالا ٩٥٧ کۆچی ژ دایك بوویەو ل سالا ١٠٥٠ کۆچی پێ مری.

حەریری د وارگەهەکێ کوردیدا نزیکی نیڤا دووێ ژ سەدێ شازدێو سەرێ سەیێ هەڤدێ زاییني ژیایە. لێ هندەك دبێژن خەلکێ (حەریرە — دێر حەریرا) لنك هەڤلێرێیە، ئەگەر خەلکێ (دێر حەریرا) بیت ئەڤە بەلگەیەکی تازە بۆ مێژووی ئەدەبی کوردی دەداتە دەست‌و ئەو ژی ئەوە کو ئەدەبیاتی کرمانجی ژووروو د وی سەردەمیدا ب ڕەنگەکێ وەسا د (بۆتان)دا گەشە کرییە تا گەهشتییە ناوچەی سۆران‌و ئەگەر میرنشینا بۆتان تێك نەچووبوایە ئەڤ دیالێکتە وەسا دا بەلاڤ بیت کو هەمی کوردا پێ نڤیسیبایە.

ئەو وارگەهـ و جڤاتگەها عەلی حەریری تێدا ژیای وەکی هەمی جڤاتگەهێن دی یێن کوردی ژ لایێ ئابووری‌و ئاڤەدانکرنێ د پاشکەفتی بووینەو دبن کارتێکرنا ئۆلێ (ئاینێ) موسلمانەتێی ڤە بووینە. ژ بەر هندێ ڕێو دەرگەه هەمی بۆ سۆفیاتیێ د ڤەکری بوون‌و ڕەهێن خۆ تێدا ببەنە خوارێ، هێلینێن خۆ د مەژیێ زاناو نە زانادا چێکەت. ژ بەر هندێ هۆزانێن عەلی حەریری یێن کو ژ دیوانا وی ماین‌و ددەست دانە، ڕوپێن وێ جڤاتگەهێ‌و وارگەهێ کوردی کو حەریری تێدا ژیایە بەر ڕوی دکەت.

عەلی حەریری هۆزان ب دیالێکتا کرمانجی ژووروو ڤەهاندینە، تا ئێستا ژ چەند پارچە هۆزانێ، حەریری زێدەتر ب دەست نەکەفتینە.

عەلی حەریری هۆزانڤانەکە سەر ب قوتابخانا مەلای جزیری بوویە، پەیوەندی ب ناڤەرۆکو ڕووخساریّ وی چەشنیّ ئەدەبا کلاسیزمی ڤە هەبوویە.

## ژ هۆزانێن عەلی حەریری

١. دیسان ژنۆ عەشقا بەری، پڕ ئەندە روونم ئا تەشە
زولفا موزەییەن عەنبەری، دەعوا دگەل خالا رەشە

٢. خالاَل دێمی دل ڕەڤا، سەد ڕوح و جانم بن فیدا
سووتم گەلۆ چوم تیّ نەما، تەرکم کردن عەقل و هوشە

٣. عەقل و هۆشم بوونە ئەسیر، دنیا کو گەهگەهـ تێتە بیر
دێم شوبهەتا بەدرا مونیر، زولفا ژ وەردیّ بێن خوەشە

٤. وەردان ژ نێڤ زولفا دەرین، شوعلا بەنەفشی تیّ وەرین
بالاو قەددا عەرعەرین، هەڕیان ل سەر ماریّ ڕەشە

٥. دیسانیّ حەی تێت و دچێت، ئیحیایی ئەمواتان نەبیت
وەجهان مودام نوور ژیّ تەچێت، دێم شوبهەتی شەمعا گەشە

٦. شەمعا شەبستانان ئەوە، وەردا گولستانان ئەوە
سڕی تەبستانان ئەوە، شۆخا (حەریری) دلّ گەشە

٧. عــەجیب لــەتیفو جندییــە، ئــەزمان نــەزانو (ڕۆمــی)یــە
ئاگەهــ ژ عەشـقبازان نییــە، مەســتو خومــارو ســەر خوەشــە

٨. سەرخۆشــێ جامــا شــەربەتێ، دێــم شــوبهی شــەمعا زولــەتێ
حوریــا دبــاغێ جەننــەتێ، ســەردارێ چــەندین مەهوەشــە

٩. مەهوەش کو وەستان سەف ب سەف، ئەو هاتە دەر میری دگەف
وان گـۆت (عـەلی)یـۆ لاتەخـەف، مـە ب مردنــێ قـەوی خوەشـە

(سێ دێری لە سەرەتاوە بۆ لەیەرکردنە)

## لێکدانا پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| ژنۆ | : | سەر لەنوێ |
| بەری | : | پێشوو |
| ئەندە روون | : | ناوەوە، ناو دەروون |
| ئاتەش | : | ئاگر |
| موزەیەن | : | ڕازاوە، خەملاندی |
| دەعوا | : | شەڕ، جەنگ |
| ت گەل | : | لەگەڵ |
| دێم | : | دەموچاو |
| دڵ رەڤا | : | دڵی رفاند |
| گەلۆ | : | خەڵکینە، کوڕینە |
| چو | : | هیچ |
| بێن | : | بهێن– بۆن |

ژ نێڤ : لەنێوان

هەریان : شین بوون، ڕوان

حەی : مار

شەبستان : شەوە زەنگ، تاریکستان

تەبستان : هاوین

جندی : جوان، جحێل

مەست : سەرخۆش

مەهوەش : نازدار، وەکو مانگ

میسری : شیری میسری

ت کەف : ددەستدا، لە جەنگدا

وان : ئەوان

لاتەخەف : مەترسە

دەڤەر : ناوچە

دەست هەلی : زیرەکی

ئێخستنە بەرێك : ڕێکخستن

ناڤدار : ناودار

گەلەك : زۆر

دادنێت : دادەنێت

مشەختی : کۆچی

چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ: مردووە، کۆچی دوایی کردووە

ب یێ (مری) : بە مردوویی

چەرخ : سەدە

تنێ : تەنیا

| | | |
|---|---|---|
| نهۆ | : | ئێستا |
| مالك | : | دێره شیعر |
| نیڤا دووێ | : | نیوەی دووەم |
| جڤاتگەهـ | : | کۆمەڵگە |
| ئۆل | : | ئایین |
| ڕێ | : | ڕێگا |
| ڕەهـ | : | ڕەگ |
| مەژی | : | مێشك |
| چێکەت | : | دروست بکات |
| بەر ڕوی دکەت | : | دیار دەکات، پێش دەخات. |

١. دیسان سەر لەنوێ عەشقەکەی پێشوو سەری هەڵدایەوەو پڕ دەروونی کرد لەئاگر. ئەو زوڵفەی بە عەنبەری بۆن خۆش ڕازاوەتەوە، شەڕ لەگەڵ خاڵی ڕەشی دەمو چاوی یار دەکات.

٢. ئەو خاڵەی وا بەدەمو چاوییەوە دڵمی ڕفاند، با سەد ڕۆحو گیانم فیدای بێت، ئای خەڵکینە ئەو منی سوتاندو هیچم تێدا نەماو عەقڵو هۆشی منیان بەجێ هێشت.

٣. عەقڵو هۆشی من بوون بە یەخسیری ئەو خاڵە ڕەشەو جاروبار کە دنیای دێتەوە بیر دەبینێ دەمو چاو لە مانگی یەك شەوەی ڕووناك دەچێتو زوڵفیشی لە گوڵی بۆن خۆشی.

٤. گولّ لەناو زولّفان دەڕوێن، شوعلەی وەنەوشەیان بەسـەردا وەریـوە، بالاّو قەد وەك عەرعەرن‌و ماری ڕەشـیان لەسـەر ڕواوە. مـاری ڕەش (واتە زولّف).

٥. دیسان ئەو مارە ڕەشە دێت‌و دەچێت، مـردووان زینـدوو دەكاتـەوە (واتە ئەو زولّفە مردوو زیندوو دەكاتەوە).

دەم‌و چاو وەك مەی بەردەوام ڕووناكی لێ هەڵدەستێت‌و دەم‌و چـاو وەك مۆمی گەشە.

٦. ئەو دەم‌و چاوەیە مـۆمی شـەوە زەنـگ، هـەر ئـەو گـوڵی گـوڵزاران، ئـەوە نهێنـی گـەرمی دڵ، شـۆخێكی دڵگەشـی خـەڵكی حـەریرە یـا شۆخی دڵگەشی عەلی حەریرییە.

٧. زۆر سەیرو جوان‌و قەشەنگە، زمانێ كوردی نازانێـت چـونكە ڕۆمییـە واتـە توركـە، ئاگـای لـە عاشـقان نییـە، چـونكە هەمیـشە مەسـت‌و خومارو سەرخۆشە.

٨. بـەجامی شـەربەت سەرخۆشـە، دەم‌و چـاوی وەك مۆمێـك وایـە لـە تاریكیدا، لەباغی بەهەشتدا حۆرییە، سەر دارو گەورەی پۆلی جوان‌و نازدارانە.

٩. نازداران پۆل بـە پـۆل ڕاوەسـتان‌و ڕیزبـوون، ئـەو نـازدارەش هـات‌و شێری میسری بەدەستەوەبوو، ئەوان وتیان (عـەلی) مەترسـە، ئێمـە بە مردن زۆر دڵمان خۆشە.

# مــەحــوی

## ١٨٣٠- ١٩٠٦ز

### ژیانی:

هۆنەری پایە بەرزمان ناوی محەمەدە، کوڕی مەلا عوسمانی باڵخییە، لـە نـەوەی پـیرو زانـای (شێخ ڕەش)ە، ساڵی(١٨٣١ز–١٨٣٢ز)لە سلێمانی هاتۆتە دونیاوە، حەوت ساڵان بوو، خراوەتە بەر خوێنـدن، ماوەیـەك لای باوکی کتێبە وردەڵـەکانی خوێنـدووە، پاشـان بـە فەقیـەتی بـۆ خوێنـدن چووە بۆ شـاری (سـنە، سـابلاغ)، لەدواییـدا گەڕاوەتـەوە سـلێمانی، لای مامۆسـتا ناودارەکـانی ئـەو ناوچـەیە خوێندوویـەتی. پاشـان چـووە بـۆ بەغداو لای زانای بەناوبانگی کورد مفتـی زەهـاوی خوێندوویـەو ماوەیـەك لای ئەو ماوەتەوە تا ئیجازەی مەلایەتی پێداوەو کردوویە بـە مامۆسـتای مزگـــەوتی ئیمـــام ئـــەعزەم لـــە بەغـــدا. لەســـاڵی (١٨٦٢ز) بەغـــدای بەجێهێـشتووەو گەڕاوەتـەوە بـۆ سـلێمانیو بـووە بـە ئەنـدامی دادگـا. لەساڵی (١٨٦٨ز) دا بـەهۆی مردنـی باوکییـەوە. دەسـتی لـەکاری مـیری کێشاوەتەوەو بـووە بـە مـەلاو دەسـتی کـردووە بـە دەرس وتنـەوە بـە فەقێیان.

لەســاڵی (١٨٨٣ز) مــەحوی چــووە بــۆ حــەجو لــەوێوە چــووە بــۆ ئەسـتەممولو لـەڕێگای پیـاو مـاقووڵانی کـوردەوە چـاوی بـە سـوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی کـەوتووە، سـوڵتان ڕێزێکـی زۆری لێ گرتـووەو فەرمانی داوە کە خانەقایەکی لە سلێمانی بۆ بکەنەوە، بەناوی (خانەقای

مەحوی)یەوە. کە گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی خەریکی دەرس وتنەوەی زانستو ئاینو ڕابەری کردنی خەڵك لەبارەی سۆفیەتی دابووە. لە ساڵی (١٩٠٦ز) کۆچی دوایی کردووە لە خانەقاکەی خۆیدا بەخاك سپێردراوە.

لە هەرەتی تەمەنیدا جۆشو خرۆشێك لە دڵیدا پەیدابووەو بەرەو مەیدانی عەشقەوەی بردووە، هەر ئەو عەشقە بەتینە بووەتە ئیلهامی هۆنراوە وتنی، ئینجا وشەی (مەحوی) هەڵبژاردووەو کردوویە بەنازناوی هۆنراوەی خۆی.

ئەو بنەماڵەی کە مەحوی تیایدا گەورە بووەو پەروەدەکراوە وای لێکردووە کەسەر بەرێتە مۆزەخانەی ئەهلی سۆفێنزمییەوەو بەراوردێکی بیرو باوڕەکانیان لەگەڵ دڵی خۆیدا بکات، هەر بیرو باوەڕی سۆفیەتی مەحوی کردە هۆنەرێکی ناوداری سۆفیەتی.

مەحوی بە یەکێك لە شاعیرە بەرزەکانی کلاسیزمی کوردی دادەنرێتو لەسەر ڕێڕەوی نالی ڕۆیشتووە.

## ڕووخساری هۆنراوەکانی:

١. کێشی عەرووزی عەرەبی بەکارهێناوە.

٢. یەکێتی قافیەی پاراستووە، واتە سەرتاسەری هۆنراوەکە لەسەر یەك قافیەیە.

٣. وشەی عەرەبیو فارسی لە هۆنراوکانی دیارە.

٤. وشەکاریو وردەکاری زۆری بەکارهێناوە بەدوای وشەو دەربڕینی گران گەڕاوە.

## ناوەڕۆکی هۆنراوەکانی:

لـەڕووی ناوەڕۆکــەوە هۆنراوەکــانی لــەبارەی ئــایینیو فەلــسەفەو سۆفیەتیو هەستی نەتەوەییە.

١. ئەمە نموونەیەك لەهۆنراوەی سۆفیەتی مەحوی:

**١. دیــارم دەیــری عیــشقە،جێبــە ســووتن بــێ لــەوێ دەگــرم**
**کـە مـن مـشتێ چڵو چێوم، بەچی بم، کـەڵکی کـێ دەگـرم**

**٢. نەگەییــە دامــەنی دەســتی دوعــا، جــا دەبمــە خــاکی ڕێــی**
**تەریقــەی گۆشــەگیری بــەردەدەم، ئــەمجارە ڕێ دەگـــرم**

**٣. کــەدادی یەئــسی خــۆمم بــردە لا، ئــەم عارفــە تونــد بــوو**
**وتــی: ئــاخر ســبەینێ جەژنــە، خــوێنی تــۆ لــەپێ دەگــرم**

**٤. لـە ڕوو سوریی عیبـادەت لامو لـەڕوو زەردی خەجاڵـەت مـام**
**بــەناوی ســێوی نــاوم باغــەوانو مــن بــەهێ دەگـــرم**

**٥. لەســەر خۆچــوونە، شــەیدابوونە، قــوڕ پێوانــە، ســووتانە**
**هــەتا مــردن، مەحەببــەت ئیــشی زۆرە، ڕیــزی لێ دەگــرم**

٦. چ شـۆخە ئـاگرم تێبـەر دەداتو پـێم دەڵـێ یـا شـێخ
بـە خاشـاکی دەوت شـوعلە، عەسـامە دەسـتی پـێ دەگـرم

٧. کەسـینەی ڕێـشمی بـەو تیغـی نـازە ئـەنجن ئـەنجن کـرد
وتـــی: پەژموردەیـــە ئـــەم لالـــەزارە، ئـــاوی تێـــدەگرم

٨. لـە پاداشـتی قـسەی سـەردا هەمـە ئـاهو هەناسـەی گـەرم
کەسـێ شـێتانە بـەردم تێگـرێ، مـن بـەرقی تێـدەگرم

٩. شـــوکر هوشـــیارە مـــەحوی، تێـــدەگا دونیـــا خەراباتـــە
کـە بـەد مەسـتی بکـا ئـەهلی، خراپـەی بۆچـی لێـدەگرم

(لە سەرەتاوە سێ دێر بۆ لەبەرکردنە)

مـەحوی لـە مەیدانی کوردایـەتی لـەم چـوارینانەی خـوارەوەدا هەسـتی نیشتمان پەروەریو نەتەوەپەرستی خۆی دەربڕیوەو شانازی پێوە کردووە. دەڵێت:

١. لـە دەوری دڵمـی کـە دی ئـەم هـەموو غـەمو تەعەبـە
دەروونـــی کەیلـــە لـــە زووخـــاو و دەردو تـــا بەلەبـــە
وتـــی: ببـــێ دڵـــە! وەك تـــۆ خـــەرابو شـــیفتە حـــاڵ
بـــەڵێ هەیـــە لـــە مـــن ئاشـــفتە تـــر: وڵاتـــی بەبـــە

**٢. بنووســه، پــیری دڵــم ئــه‌مری كــرد، ئیتاعــه‌م كــرد
لــــه ئیبتیـــداوه كــــه بــــه‌ینیٚ موناســــبی دیــــوان
گه‌دایـــه‌كی وه‌كـــو مـــه‌حوی، قه‌ڵه‌نـــده‌رێكی كـــورد
میـــــسالی پادشـــــه‌هی فورســـــه، ســـــاحێبی دیـــــوان.**

(یه‌ك له‌م چوارینه بۆ له‌به‌ركردنه)

## واتای وشه‌كان:

| | | |
|---|---|---|
| دیار | : | كۆی داره به واتا شوێن‌و وڵات |
| ده‌یر | : | شوێنی ڕه‌به‌نه بۆ مه‌سیحییه‌كان |
| گۆشه‌گیری | : | دووره په‌رێزی |
| عارفه | : | ڕۆژی پێش جه‌ژنی قوربان |
| لام | : | من ته‌ریك‌و بێ به‌ش‌و مل پێچی كه‌رم |
| شۆخ | : | عه‌یارو زۆرزان |
| ڕێش | : | بریندار، سینه‌ی ڕێشمی: سینگی بریندارمی |
| په‌ژمورده | : | سیس بوو |
| سه‌رد | : | سارد |
| خه‌رابات | : | مه‌یخانه |
| به‌دمه‌ستی | : | سه‌رخۆشی له‌راده‌به‌ده‌ر |
| چڵ‌و چێو | : | ئێسك‌و پروسك |

به‌ناوی سێوی ناوم: واته به‌سێو ناوی بردووم، ناڤیٚ من كرییه سێڤ

# شێخ ڕەزای تاڵەبانی

## ١٨٣١ز- ١٩١١ز

### ژیانی:

شاعیری گەورەمان ناوی (ڕەزا)یەو کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحموودی زەنگەنەیەو لە ساڵی ١٨٣١ زایینی لە گوندی (قرخ)ی سەر بەشاری کەرکووك هاتۆتە دنیاوە، لە مزگەوتدا خوێندوویەتی، جگە لەزمانی دایك زمانەکانی عەرەبیو فارسیو تورکی بە باشی زانیوە، هۆنراوەی بەم چوار زمانە نووسیوە تێیاندا باڵا دەست بووە، شارەزای ئەدەبیاتی فارسیو عەرەبیو تورکی بووە، ماوەیەك ژیانی خۆی لە ئەستەنبۆڵ بەسەر بردووە پاش گەڕانەوەی بۆ کەرکووك لەساڵی ١٨٩٨ چووەتە بەغدا لەوێ پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەی سەلیم بەگی بابانو سەید عبدولرەحمان نەقیبی بەغداد زۆر خۆشبووە، تا لەساڵی ١٩١١ی زایینی لەتەمەنی (٧٩) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی نێژراوە...

دیوانەکەی تاوەکو ئێستا چەند جار لە کوردستانو لە دەرەوەی کوردستاندا چاپکراوە، دیوانەکەی کراوە بەسێ بەش (بەشی کوردیو فارسیو تورکی) لە هەر سێ زمانیشدا شاعیرێکی زۆر سەرکەوتووە، تەنانەت وای لێ هاتووە هەندێك لە شارەزایانی ئەدەبی تورکی بە شاعیرێکی گەورەی نەتەوەی تورکی دابنێن کە ئەمەش ڕاست نییە، ستەمێکی گەورەیە کە لەم شاعیرە گەورەیەی کورد دەکرێت:

١. چاپی یەکەمی دیوانەکەی لەساڵی ١٩٣٥ لەلایەن مەریوانییەوە لە بەغدا بووە.

٢. (دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی) چاپی ساڵی ١٩٤٦ لە بەغدا لەلایەن شێخ عەلی تاڵەبانییەوە چاپکراوە.

٣. (دیوانی شێخ ڕەزا) چاپی ساڵی ١٩٩٩ لە سلێمانی ئامادەکردنو لێکدانەوەی ئومێد کاکە ڕەشو حەمە بۆر.

٤. (دیوانی شێخ ڕەزا) ساغکردنەوەی شوکور مستەفا چاپی ساڵی (٢٠٠٠) لە شاری هەولێر.

٥. (دیوانی شێخ ڕەزا) ساغکردنەوەو لێکدانەوەی د. موکەڕەم تاڵەبانی لەساڵی (٢٠٠١) لەشاری هەولێر چاپکراوە.

٦. (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) کەڵە شاعیری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەلە لەسەر ژیانو هۆنراوەکانی لەلایەن نووسەر (ئەحمەد تاقانە).

## مەبەستەکانی شیعری شێخ ڕەزای تاڵەبانی:

هۆنراوەکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی ئەم مەبەستانەیان تێدا دەبینرێت:

**١. داشۆرین و شەڕە جنێو (جوێن):**

ئەگەر سەرنج بدەینە دیوانی شێخ ڕەزا ئەوە دەبینین زۆربەی هۆنراوەکانی، داشۆرینن واتە هۆنراوەی (هەجوون، واتە ئەم بابەتە بابەتی سەرەکی شیعرەکانی شێخ ڕەزا بووە، بە هونەرێکی بەرزو زمانێکی ئاگرینەوە دایڕشتوون، قسەی سەیرو سەمەرەن کە نەك هەر پسپۆرو شیعر دۆستان بەڵکو بەگشتی زۆربەی خەڵکەکە حەزیانی لێی بووە، بۆتە مایەی بەناوبانگ بوونی شاعیر، واتە هۆیە سەرەکییەکەش ئەو هۆنراوە پڕ لە جنێوو قسە پەردە لێ هەڵماڵراوانەیەتی، بۆیە شاعیر شانازی بۆ بەزمانی خۆی دەکات لەم بارەیەوەو دەڵێت:

**تۆ هەتە تیغی دەبان، من هەمە تیغی زبان**
**فەرقی ئەم دوو تیغە هەروەك ئاسمان و ڕێسمان**

(بۆ لەبەرکردنە)

کە لەم دێرەدا شێخ ڕەزا زمانی شیعرەکانی خۆی بە تیغ دادەنێت بەرامبەر خەنجەری دەبانی خەڵك واتە هی ئەو تیژترە لەهی ئەوان.

هۆنراوە شەڕە جنێوەکانی نێوان شێخ ڕەزاو شاعیری گەورە (جەمیل صدقی زەهاوی) لەلایەك و شێخ ڕەزاو شوکری فەزلی لەلایەکی ترەوە هەر لەو شەڕە جنێوانە دەچێت کە لە نێوان شاعیرانی عەرەب (جەریر)و (فەرەزدەق) کراوە بەڵام ئەم هۆنراوانەو هۆنراوەکانی تری هێندە ڕوو هەڵماڵراون کە ڕووی ئەوەمان نییە بیانخەینە سەر لاپەڕەکان لێرەدا

تەنها ئەم هۆنراوەیەی دەخەینە ڕوو کە زەمی (شێخ عەلی) دەکاتو دەڵێت:

١. **بێگانــە هــەموو ســاحیبی جــاهو جەبــەڕووتن**
**بێــچارە بــرای (شــێخ عــەلی) مــوفلیسو ڕووتــن**

٢. **ئــەی شــێخ عــەلی چــاکە وســووقت بــەبرا بــێ**
**بـاوەڕ مەکـە بـەم خەڵقـە کـە وەك توولـە لـەدووتن**

٣. **قەومێ کە لە عەهدی پدەرت حەلقە بە گۆش بوون**
**تــەحقیقی بزانــە بــە خــودا جوملــە عــەدووتن**

٤. **ڕەحمیــان نییــە دەربــارەیی تــۆ خــزمو ئــەقارب**
**موشــفیقترە، بێگانــە، لەمانــە کــە عــەمووتن**

٥. **نــادانو قورمــساغو نــەزانن کــە ئەمانــە**
**گــاهێ لــە ســەما، گاهــ لــە ســەیری مەلــەکووتن**

٦. **ئـەم تەکیـە نـشینانە چـە دەروێـشو چـە سـۆفی**
**هــەر چــەند بــەدڵ موشــتەغیلی زیکــرو قنــووتن**

٧. **وەك حاجی مابەینی (سەفا)و (مەروە) بە تەعجیل**
**بـۆ لوقمـە ئـەمانیش بـە مەسـەل یـونسو حـووتن**

٨. جومعانــه بــڕاوه، بــه خــودا موفليــسه (لاميــع)
نــــهپوولی حـــهمامی ههیـــه نـــهپارهیی تـــووتن

(له سهرهتاوه سێ دێر بۆ لهبهرکردنه)

## ٢. نیشتمان پهروهری و شانازی کردن:

شێخ ڕهزا لـهباری نیشتمانپهروهریشدا شـاعیرێکی بـێ وێنـه بـووه، لهدیوانهکهیدا کۆمـهڵێك هـۆنراوهی وا دهبینرێـت کـه لووتکـهی ههسـتی نیشتمانپهروهرییهو شانازییهکی بێ وێنه به دهوری میرنیشینهکانی بابان دهکات که لهشاری سلێمانی فهرمانڕهوا بوون ئهویش وهکو ڕۆشـنبیرێکی هۆشیار ئهوهی زانیوه که لـهناو چـوونی میرنـشینی بابـان زیـانی خـۆیو نهتهوهکهیهتی، بۆیه ههناسهی سـاردی بـۆ ههڵدهکێـشێو لـه ههسـتێکی نهتهوهییهوه باسی (سلێمانی)ی پایتهختی بابان دهکاتو دهڵێت:

١. لـــــهبیرم دێ ســــولهیمانی کــــه دارو لــــولکی بابــــان بــــوو
نــه مــهحکوومی عهجــهم، نــه سوخرهکێــشی ئــالی عوسمــان بــوو

٢. لهبــــهر قــاپی ســـهرا ســـهفیان دەبەســـت شــێخو مـــهلاو زاهیــد
مـــهتافی کهعبـــه، بـــۆ ئـــهربابی حاجـــهت گـــردی ســـهیوان بـــوو

٣. لهبـــهر تـــابووری عهســـکهر ڕێ نـــهبوو بـــۆ مهجلیـــسی پاشـــا
ســـــهدای موزیقـــــهو نـــــهقاره تـــــا ئـــــهیوانی کـــــهیوان بـــــوو

**٤. درێــغ بــۆ ئــەو زەمانــە، ئــەو دەمــە، ئــەو عەســرە، ئــەو ڕۆژە**
**کــە مەیــدانی جریــد بــازی لــە دەوری کــانی ئاســکان بــوو**

**٥. بــەزەربی حەملــەیێ بەغــدای تەســخیر کــردو تێــی هەڵــدا**
**ســولەیمانی زەمــان ڕاســتت ئــەوێ بــاوکی ســولەیمان بــوو**

**٦. عــەرەب ئینکــاری فــەزلی ئێــوە ناکــەم ئــەفزەڵن، ئــەمما**
**ســەلاحەددین کــە دنیــای گــرت لــەزومرەی کــوردی بابــان بــوو**

**٧. قوبــووری پــڕ لــەنووری ئــالی بابــان پــڕ لــە ڕەحمــەت بــێ**
**کــە بــارانی کــەفی ئیحــسانیان وەك هــەوری نیــسان بــوو**

**٨. کــە عەبــدوللا پاشــا لەشــکری والی ســنەی شــڕ کــرد**
**ڕەزا ئــەو وەختــە عــومری پێــنجو شــەش تیفڵــی دەبــستان بــوو**

(لە سەرەتاوە سێ دێر بۆ لەبەرکردنە)

لە شیعرێکی تر دەڵێت:

**زوبدەی مەتاعی حیکمەتە ئەم شیعری کوردییە**
**هەرزانــە بــێ موبالەغــە حــەرفێ بــە گەوهــەرا**

(بۆ لەبەرکردنە)

لێرەدا دیسان لە هەستێکی نیشتمانپەروەرییەوە شانازی بەزمانی کوردیو وشەی کوردی دەکاتو دەڵێت پارچەی ڕەنگاو ڕەنگی بە نرخی حیکمەت کە هێنراوەتە مەیدانەوە شیعری زمانی کوردی خاوێنترو پاکژتری ئەو پارچەو ئەو کوتاڵەیە، ئەگەر بێتو تاقە پیتێکی بفرۆشی

(تەنانەت بە زێڕیش) لەبەر ئەوە ئەم بەنرخترە هەر دەخەڵەتێت، دیارە ئەم شیعرەی منیش دایدەنێم یەکێکە لەو شیعرە کوردییە بەنرخانە:

### ٣. ستایش:

شێخ ڕەزا لەستایشدا کردنیشدا دەستێکی باڵای هەبووە کە هەندێك کەسی ستایش کردووە، کەم شاعیر هەیە لەم بابەتەشدا بیگاتێ، ئەوەتە کە ستایشی کاك ئەحمەدی شێخ دەکات دەڵێت:

١. مەربووتە حەیاتم بە سولەیمانیو خاکی
خۆزگەم بەسەگی قاپییەکەی ئەحمەدی کاکی

٢. ئەو قدوەی ساداتە کە سوکانی سەماوات
شەڕیانە لەسەر سوجدە لەبەر مەرقەدی پاکی

٣. بۆ دەستو عەسا نازگەکەی داخە دەروونم
قوربانی عەسای دەستی دەبم، سۆڵو سیواکی

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## ٤. دڵداری:

شێخ ڕەزا ڕێگەی شیعری دڵداریشی گرتووە وەکو هەموو شاعیرە کلاسیزمییەکانمان، جوانترین شیعری دڵداری کوردیی نووسیوەتەوە، بە سۆزێکی ڕاستەقینەوەو زۆر ڕاستگۆیانە، کۆمەڵێك شیعری دڵداری لەدیوانەکەیدا دەبینرێت، وا لێرەدا یەکێك لە شیعرە تەڕو ناسکەکانی دەخەینە ڕوو کە پێنج خشتەکییەکە لەسەر شیعرێکی مستەفا کوردی:

**دڵی بردم بەنازو عیشوە دیسان، شۆخێ، عەیارێ**
**فریبی دام بە سیحری چاوی خۆی مەحبووبێ، سەحارێ**
**لە هیجرانا تەقەم کرد ئەی ڕەفیقان کوا مەدەدکارێ**
**ئەمان مردم عیلاجێ سا لەڕێی پێغەمبەرا چارێ.**
**ویساڵ یا قەتڵو یا تەسکین، لەهەرسێ بۆم بکەن کارێ**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## ڕوخساری شیعرەکانی:

شێخ ڕەزا بە گەورەترین شاعیری کلاسیزمی کوردی دادەنرێت کەسەر بە قوتابخانەی شیعری بابانە، چونکە یەکێکە لەو شاعیرانەی کە لەشاری کەرکووك لەسەر ڕوخساری شیعرەکانی نالیو سالمو کوردی هۆنراوەکانی هۆنیوەتەوە، واتە لە شیعرەکانیدا لەڕووی ڕووخسارەوە ئەم خالانە دەبینرێت:

١. بەزمانێکی کوردی تێکەڵ بە وشەی عەرەبیو فارسیو تورکی هۆنراوەکانی نووەسیوەتەوە.

٢. بەکارهێنانی کێشەکانی (عەرووز)ی عەرەبی.

٣. لەڕووی سەرواوە پەیڕەوی شیعری کلاسیزمی کوردی کردووە، واتە سەروای یەك ڕەویەی بەکارهێناوە کە پێی دەوترێت سەروای یەکگرتوو، واتە هەموو دێڕەکان بەیەك پیت کۆتاییان دێت.

٤. پاراستنی بابەتەکانی غەزەلو چامە لەهۆنراوەداو پەیڕەوکردنی بابەتەکانی ڕەوانبێژی واتە یاری کردن بە وشەو وشەکاری لەناو هۆنراوەکانیدا.

## ناوەڕۆکی شیعرەکانی

لەڕووی ناوەڕۆکیشەوە ئەم خاڵانە دەبینرێن:

١. لەهۆنراوەکانیدا هەموو مەبەستەکانی هۆنراوەی گوتووە هەر لە داشۆرین تا دڵداریو ستایش کردنو شانازی کردنو تەنانەت شیعری ئاینیو تەسەوفی هەیە، بەڵام لە هۆنراوەی داشۆرین پلەی یەکەمی هەیە.

٢. هۆنراوەی فارسیو تورکی زۆر کاریان تێکردووە، بەتایبەتی هۆنراوەکانی (حافزی شیرازی) گەورە شاعیری فارسی کاریگەرییەکی زۆرییان لەسەر هەبووە.

٣. یەکێکە لەو شاعیرانەی کەسەر بە قوتابخانەی بابان بووە واتە سەر بە قوتابخانەی شیعرییەکەی نالیو سالمو کوردی، بەتایبەتی شاعیری گەورە (نالی).

# نـــاری
## ١٨٧٤- ١٩٤٤ز

### ژیانی:

هۆنەری پایە بەرزمان ناوی (کاکە حەمـە)یـەو کـوڕی مـەلا ئەحمـەدی کوڕی مەلا محەمەدی کوڕی مەلا عەبدولرەحمانە، لەساڵی (١٨٧٤ز) لـە گوندی (کیکن)ی نزیك مەریوانـەوە هاتۆتـە دونیـاوە، لـە تەمـەنی شـەش سـاڵاندا لای بـاوکی دەسـتی بەخوێنـدن کـردووە، قورئـانو کتێبـە وردەڵـەکانی تـەواوکردووە، ئینجـا بـە فەقێیـەتی بـەدوای خوێنـدن لـەم شـوێنانە (مـەریوان، سـنە، پێنجـوین، سـلێمانی، بانـە، سـابلاغ، وان، باشقەڵا، هەولێر، ڕەواندز) گەڕاوە. لە ڕەواندزێ لای مامۆستا ئەسعەدە فەندی خەیلانی ئیجازەی مەلایەتی لەساڵی (١٨٩٧ز) وەرگرتووە.

پاشان گەڕاوەتەوە بۆ مـەریوانو لـەوێ چـووە گونـدی بێلـووی نزیـك مـەریوان، بـەدەرس وتنـەوە خـەریك بـووە تـا لەسـاڵی (١٩٤٤ز) کۆچـی دوایی کردووە لەدێی بێلوودا بەخاك سپێردراوە.

هـۆنراوەی نـالیو مـەحوی کاریـان کردۆتـە سـەر نـارىو تـەلی سـۆزی شـاعیریان بزوانـدووەو مێـشکیان زاخـاو داوە. وشـەی (نـاری)ی هەڵبژاردووەو کردوویە بە نازناوی هۆنراوەی خۆی.

نـاری یەکێکـە لـە لووتکـە بـەرزو دیارەکـانی ڕێبـازی کلاسـیزمی کوردیمانو بە بەرهەمە ڕەنگینەکانی ئەو ڕێبـازە ئەدەبییـەی گەشـەدارتر کردووە.

## ڕوخساری هۆنراوەکانی:

١. کێشی عەرووزی عەرەبی بەکارهێناوە

٢. یەکیەتی قافیەی پاراستووە.

٣. وشەی عەرەبیو فارسی لە هۆنراوەکانیدا دیارە.

٤. گرنگی بە وشەکاریو ڕازاندنەوە داوە، لە وشە دەربڕینو بەهرەی وشە ئاراییدا شارەزاییەکی بەتوانا بووە.

## ناوەڕۆکی هۆنراوەکانی:

لەڕووی ناوەڕۆکەوە ئەم مەبەستو بابەتانە (دڵداریو خۆشەویستی، ستایشی ئایینی، نیشتمان پەروەریو نەتەوایەتی) بە ئاشکرا لە هۆنراوەکانی دەدرەوشێنەوە.

١. **هۆنراوەی دڵداری:** ناری هۆنراوەی دڵداریو خۆشەویستی هەیە، ئەمجا ئەو دڵدارییە حەقیقی بێت یان مەجازی بێت، گرنگ ئەوەیە بەدڵو دەروونێکی پڕ بەجۆشی عەشقەوە ئەم هۆنراوە ئاگرینانەی وتووە.

**١. چاوەکەم من بۆیە دایم کارو پیشەم زارییە**
**حاکمی چاوت لەگەڵ من مایلی غەددارییە**

**٢. شۆڕشو ناڵینی کەس بێ وە جهو بێ عیللەت نییە**
**ئاهی من فەریادی بولبول ئیشی بێ غەم خوارییە**

٣. من هەر ئەو ڕۆژە دەسم شۆری لە ڕۆحی خۆم کەدیم
حەزرەتی خوون خواری ئەبرۆت مەشرەبی خوون خوارییە

٤. گەر دەپرسی بۆچی بێ نەشئەو مەلوول‌و عاجزی
ڕوومەتی زەردم عەزیزم شاهیدی بێ یارییە

٥. کەم بە خەندە بێ بەلامۆ حەیفە تانەم لێ مەدە
لێم گەڕێ تو بێ‌و خودا ئەم جارە دەردم کارییە

٦. دڵ لە شامی پەرچەمی ڕووتا بەدایم بێ خەوە
چونکە کێشکچی لە شەودا عادەتی بێدارییە

٧. حیکمەتی پڕ مەسئەلەی کوڵمت لە بۆ کێ حەل دەبێ؟
هەر سەحیفە سەد ئیشارەو ڕەمزی تێدا جارییە

٨. خاڵی ڕوخسارت هیدایەت بەخشە، شەرحی زولفەکەت
قازی ئاسا حاشیەی ئەگریجەکانت لارییە

٩. ڕووت وەکوو ئاتەش موژەت وەك شیشە ئەبرۆت قیمەکێش
میروەحەت زولف‌و کەبابت جەرگی پارەی نارییە

(لە سەرەتاوە سێ دێر بۆ لەبەرکردنە)

۲. **هـۆنراوەی نـاییینی:** نـاری بـەدڵێکی پـڕ جـۆش‌و خرۆشـەوە، بەدەروونێکی بە سۆزەوە هاتۆتە سەر باسی ستایشی ئاییینی‌و وتوویە:

**۱. سـووڕەتی یاسـین کـە وەسـفی حـەزرەتی لـەولا دەکـا**
**ئـەهلی دڵ مایـل بـە جیلـوەی سـوورەتی تاهـا دەکـا**

**۲. خـاکی بـەر دەرگـاهی قەسـری گـەر بەسـەرداکا، گـەدا**
**هـەر نـەفس نـەفرەت لـەتاجی قەیـسەرو دارا دەکـا**

**۳. ئاسمـان وەك موشـتەری هـەر دەم بـە میزانـی وەفـا**
**کەسـبێ هـەر شـامێ بـەیادی دەولـەتی ئەسـرا دەکـا**

**٤. گـەر تەسـەورکا مەسـیحی تـەختی عەرشـی ئـەعزەمی**
**تـا ئەبـەد تـەرکی بـەیانی ڕەفعـەتی عیـسا دەکـا**

**٥. نـووری عیـشقی تـۆ لەسـەر تـوری دڵـی موسـا مەگـەر**
**دای لەسـەر سـینەی بـە شـەوقی دڵ یـەدی بـەیزا دەکـا**

**٦. بـۆ خـەلیلان گـەر نەسـیمی گوڵـشەنی لوتفـت ببـێ**
**ناری نەمردووی بـە سـەحنەی (جەننـەتو لـمەئوا) دەکـا**

(لە سەرەتاوە سێ دێر بۆ لەبەرکردنە)

**٣. هۆنراوەی نیشتمان پەروەری:** ناری بەناوی سۆزی ئایینیەوە باسی نیشتمان دەکاتو لەناخی دەروونییەوە ئاخ بۆ نیشتمان هەڵدەکێشێت کە بەو شێوەیەی دەیبینێت:

**١. ئەی خاکی وەتەن بۆچی نەما سەیرو سەفاکەت؟**
**بۆ زێڕو زەبەر بوو بەدەمێ، قەسری وەفاکەت؟**

**٢. بۆ گوڵشەنی ئاوابی مەحەببەت نییە ئەمڕۆ؟**
**بۆ سازە لەبۆ نەشتەری دڵ خاری جەفاکەت؟**

**٣. بۆ دڵ بەدڵی مەیلی نەماوە لە وەتەندا؟**
**بۆ ڕووی لەتەرەف قیبلە نەما قیبلە نوماکەت؟**

**٤. بۆ قاعیدەیی بوغزو حەسەد سازە لەتۆدا؟**
**بۆ پاکی شکا، پەنجەیی ئیحسانو عەتاکەت؟**

**٥. سا بۆچی نەبی تۆ بە زرێباری مەجووسی؟**
**یا چیهرەیی تۆ دیدە نەبینێ بە عەبووسی؟**

(لەسەرەتاوە سێ دێڕی بۆ لەبەرکردنە)

## واتای وشەکان:

کارو پیشەم زارییە : کارو پیشەم گریانە.

خوون خواری : خوونکاری، خوێن ڕشتن.

کێشکچی : ئێشکچی، پاسەوان.

ئاتەش : ئاگر.

میڕوەحە : باوەشێن.

قازی : لاری: ناوی مصلح الدین لارییە، خەڵکی ناوچەی لارستانە، پەڕاوێزی لەسەر زۆر کتێبی دینی هەیە.

جەرگی پارە : جەرگی پارچە کراو.

جیلوە : خۆ دەرخستن.

موشتەری : ناوی ئەستێرەیەکە لە ئاسمان.

خار : دڕك.

زێڕو زەبەر : مەبەست شاری زرێبارە کە ڕۆچوو، ئێستا دەریاچەیە بەناوی زرێبار ناسراوە لەناوچەی مەریوان لە کوردستانی ئێران.

بە عەبووسی : بەڕوو گرژی.

# زێـــوەر

## ١٨٧٥ز- ١٩٤٨ز

شاعیری پایە بەرزو نیشتمان پەروەری کورد نـاوی عەبدوڵلایـە کـوڕی محەمەدی مەلا ڕەسووڵە، لەسـاڵی (١٨٧٥)ز لەشـاری سـولێمانیدا چـاوی بە جیهان هەڵهێناوە، حوجرەو مزگەوت کانگای بـەهرەی خوێنـدنی بـوو، جگــە لــە زمــانی کــوردی زمــانی فارســیو تــورکیو عــەرەبی زانیــوەو هۆنراوەی بەهەموویان هەیە، ئەو کاریگەریانەی بەسەر زێـوەرەوە دیـارن ئەمانەن:

١. زێوەر هەر لەتەمەنی لاویەتیدا دیمەنە ڕەنگاو ڕەنگەکانی کوردستان کاریان کردۆتە سەر دڵو دەروونیو هەستی ناسکیان جووڵاندووە.
٢. تامو بۆنی شیعرەکانی مەولەویو نالی لەهەموو دەمارەکانیدا هـاتوو چۆیان کردووەو تەلی سۆزیان بزواندووە.
٣. دیــوانی شــاعیرە فارســەکانیش کاریــان تێکــردووەو هەســتیان جولاندووە، وایان لێکردووە کە باوەش بە ئاسۆی شیعردا بکات.
٤. هەروەها ستەمو زۆرداری ڕۆژگـارو چەوسـاندنەوەی نەتـەوەی کـورد ئەوەنـدەی تـر دڵیـان هێناوەتـە کـوڵانو بـەرەو کۆشـی شـیعریان بردووەو ئیلهامی شیعریان بەتینتر کردووە.

وشـەی (زێـوەر)ی هەڵبـژاردووەو کردوویـەتی بـە نازنـاوی هـۆنراوەی خـۆی، لـە ڕۆژی ١٩٤٨/١١/١٠ لەشـاری سـولێمانیدا لـە تەمـەنی (٧٣) ساڵیدا ماڵاوایی لەم جیهانە کردووەو لە گردی سەیوان نێژراوە.

هۆنراوەکانی لەبارەی (دڵداریو خۆشەویستی، وەسفی سروشت، کۆمەڵایەتی، نیشتمان پەروەریو نەتەوەیی، فێرکردنو هاندان بۆ خوێندنو پێشکەوتن، فەلسەفە) بوون، واتە لەڕووی مەبەستەوە دەکرێن بەم جۆرانە:

زێوەر وەکو شاعیرەکانی تر لەسەرەتادا دەکەوێتە مەیدانی دڵداریو خۆشەویستییەوە، لەو بوارەدا ئەسپی خەیاڵی تاو داوەو پەپوولەی ئارەزووی لە ڕەنگینترین باغچە نیشتۆتەوە، بیری وردو خەیاڵی ناسكو سۆزی بەتین لەهۆنراوەکانیدا دیارن، یەکێکە لە شاعیرەکانی ڕیزی پێشەوەی بابەتی هۆنراوەی دڵداری لە ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردیدا.

سەیر بکە چۆن وەسفی یارەکەی دەکاتو دەڵێت:

**١. تکانی ئابڕووی چەمەن بەڕووی ئابدارەوە**
**شکانی نرخی نەستەرەن بە زولفی مشکبارەوە**

**٢. چمە لە مەی؟ لە نەی! لەجام ئەگەر بەلەنجە بێتە لام**
**بەڕووی تابدارەوە، بەچاوی پڕ خومارەوە**

**٣. عەرەق نییە لە عالەما کە لابەرێ لە دڵ غەما**
**بە غەیری قەترە عارەقێ لە ڕووت کەدێتە خوارەوە**

نیشا هەیڤێ دا کو مرۆڤی لسەر ڕوییێ ئەردی دشێت پێ خۆ پاڤێتە هەر جهەکیو ژ ئاشوبێ بگەتە ڕاستییێ! !

ل سالا (۱۹۷۰)ێ (ئارمسترونگ)ی ب هزاران هزار میلێن ڤێ ڤالایی یا دنافبەرا ئەردیێو هەیڤێ بڕینو گەهشتە هەیڤێ. ژ ئەنجامێ وێ چوونا وی بۆ هەمی مرۆڤا دیار بوو کو ئەو هەیڤا هەتا وی سەردەمی مرۆڤی ب جوانەکا ڕویتو د دانا وەسا نەبوو. بەلکی هەیڤ بوو کو پەیکەرەکێ هەرە مەزنی وەکی ئەردییەو ب ڕاستو دروستی ڕوون بوو کو ئەو ژی بارستایەکە وەکی ئەردیو وەکی بارستاییێن دی...

ژ ڤی ئەنجامی ئەو چەند خویا بوو کو زانستو پێزانینێن مرۆڤی گەهشتنە جهەکی کو ب وان پێزانینا بشێت بگەهتە گەلەك بارستاییێن ئاسمانیو پەردا ئاشوبێ داقوتیتو خو پاڤێژیتو بچیتە دناف جیهانەکا ڕاستیو کە تواریدا. ژ ڤی ئەنجامی دیار بوو کو د سەدێ بیستێ دا بیرو باوەڕو پێزانینێن مرۆڤی گەهشتنە جهەکی کو نەبتنێ نە پەنێین قولاچو کوژیێن ئەردی ئاشکەراکەت، بەلکی دەستێ خۆ درێژ بکەتو بچیت نەپەنێین ئەردی ئاشکەراکەت، بەلکی دەستێ خۆ درێژ بکەتو بچیت نەپەنێین ڤێ ڤالایا دنافبەرا ئەردو ئاسمانی ژی ئاشکەراکەت هەر ئەڤ حەزە بوو کو نەهێلا سەدێ بیستێ بسەرڤە بچیتو بلەز خۆ کرە دیاری بۆ هەیڤێو پارچێن ڕوویی هەیڤێ ژی ئینانە سەر ئەردی!.

چوونا سەر بانێ هەیڤێ ژ لایێ مرۆڤ ب ئەگەرێ هزرو بیرێن خۆشیا ژ دونیایەکێ بکەفتە دناف دونیایەکا دیو بەلکی زانستێ سەر ئەردی گەهاندە ئەسمانیو هەیڤ ژی ئاسمانێ ئینایە سەر ئەردی! ب ڤێ

چوونا سەر هەیڤێ نەخشێ هەمی رابوریێ دیرۆکی گوهۆڕیو دونیایەکا پێزانینێن دی بدەست خۆڤە ئینا بۆ هندێ دا بچیتە جهێن دی یێن ڤێ دونیایا رووبەر درێژ!

## شروفە کرنا پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| هۆزانڤان | : | هۆنەر. |
| وەك هەڤی | : | لێکچوون. |
| دز ڤریت | : | دەسورێت. |
| خەتیرە | : | مەشخەڵ. |
| خوهەلاڤێت | : | بازی دا. |
| حێبەتێ | : | سەرسوڕمانی. |
| ئاشوب | : | ئەندێشە. |
| ڤالاییی | : | بۆشایی. |
| خویا بوو | : | دەرکەوت، دیار بوو. |
| پێزانین | : | زانیاری. |
| داقوتیت | : | بتەکێنێت. |
| کەتواری | : | واقعی. |
| بێنێ | : | تەنیا. |
| نەپەنی | : | نهێنی. |
| قولاچو کوژی | : | کەلێن قوژبن. |

# پیشەسازی لەناو کوردەواریدا

پیشەسازی بەشێوەیەکی سەرەتاییو ساکار، بۆ هێنانە دی ئەو شتانەی کە پێویستی ئادەمیزاد بوون، لە کۆنەوە هەر بووە کشتوکاڵو بەدرتیژ کردن لەلایەن ئادەمیزادی کۆنەوە بۆ ڕاوو شکار، چەشنە پیشازییەك بووە بۆکاتی خۆی.

ئەمە ڕاستە، کە شۆڕشی پیشەسازی لە ئەوروپا، بزووتنەوەیەکی تازە بوو و داهێنانی ئامێرو، هێزی بزوێنەر، لە بەرهەمەکانی، ئەم شۆڕشەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیشەسازیی نەتەوەیی هەر لەناواندا بووە. جا ئێمە لەم ماوەیەدا لە داهێنانی هێزی هەڵمو دۆزینەوەی هەندێك نەزەرییەی فیزیاو داهێنانی کیمیا، نادوێین، چونکە ئەمە پەیوەندی بە پیشەسازیی گشتییەوە هەیە، کە لەکاتی خۆیدا لە ئەوروپا کەوتە ناوانەوەو خەریکە هەموو جیهان دەگرێتەوە، مەبەستمان پیشەسازیی نەتەوایەتی کوردییە.

کورد هەر لەکۆنەوە، هەموو کەلو پەلێکی کە بە خواردەمەنی دروست کردنو کشتوکاڵ بەرهەم هێنان بەکاردەهێنرێت، خۆی دروستی کردووە، وەکو دیزەو گۆزەو مەنجەڵو قاپو کاسەو کەوچكو تەنوورو فەرشو بەڕەو ناوبرێشكو تیرۆكو گەلێك شتی تر. ئەمانە دەبێت زۆر کۆن بن، چونکە لە پێویستیەکانی ژیانن. جگە لەمە داسو گاسنو هەوجارو هەموو کەلو پەلێکی تری کە پێوەندیی بە کشتوکاڵەوە هەیە، وەستای کوورە خۆی دروستی کردوون.

لەناو کوردەواریدا دەست کردی هونەریی ورد گەلێك پێشکەوتوو بووە، لەمانە بەرماڵی کوردیو جاجم ناوبانگیان دەرکردبوو، تا ئێستاش بازاڕیان هەر هەیە، لەتەك ئەمەدا وەستایانی دەست ڕەنگین، هونەر لەدروستکردنی شەترەنجو نەردو قوتووی جگەرەدا دەنوێنن.

هەندێك لەناوچەکانی تری کوردستان ناوبانگیان بەدروست کردنی هەمە جۆرە چەقۆو کێردو قەڵەمبڕ دەرکردووە، بەتایبەتی ئەو قەڵەمبڕە نایابانەی کە دەسکیان لە ئێسقانو قۆچی ئاژەڵ دروست کراوە. بەڵام ئەگەر بێینە سەر باسی خەنجەری کوردی، ئەمەیان نەك هەر لەڕووی پیشەسازییەوە وردو نایابو جوانە، بەڵکو لەڕووی ڕووخساریشەوە شێوەیەکی تایبەتی هەیە، واتە خەنجەری کوردی لەو خەنجەرانە ناکات کە لەناو میللەتانی تردا باون، چاکترین خەنجەری کوردی ئەوەیە کە دەبانی پێ دەڵێن میرو گەورەکانی کورد خەنجەری وایان هەیە کە زۆر بەنرخن، بەتایبەتی ئەوەی دەسکەکەی لە قۆچی سپی دروست دەکرێتو کالانی بەزێڕو زیوو یاقووتو مرواری دەنەخشێنرێت، خەنجەر یەکێکە لە دروشمە نەتەوەییەکانی کورد لەبەر ئەوەیە بەدیاری پێشکەش دەکرێت. پوولی پۆستەی حکومەتی کوردستانی خواروو لەناوچەی سولەیمانی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود وێنەی خەنجەری کوردیی تێدا کێشرابوو، کورد (تیخ)یش بە خەنجەر دەڵێت، وە قسەی نەستەقی کوردیش دەڵێت:

((تیخ هاوڕێی پیاوە)).

چەخماخ سازی لەناوچە جیاوازەکانی کوردستان پێشکەوتوو بوو، بەتایبەتی وەستاکانی سولەیمانی لەدەورو بەری فەرمان ڕەوایی بابانەکاندا، لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم هەموو جۆرە شیرو تیرو تفەنگێکیان دروست دەکرد، بەڵام بەناوبانگترین و گەورەترین کارخانەی چەك ئەوەبوو کە لەڕەواندز لە دەوروبەری فەرمان ڕەوایی پاشای کۆرەدا دامەزرا، ئەم کارخانەیە تەنیا چەکی سووکی دروست نەدەکرد، بەڵکو چەکی قورسی وەکو (تۆپ)یشی دروست دەکرد، ئەو تۆپانەی تا ئێستاش لە مۆزەخانەکاندا پارێزراون نیشانەی پێشکەوتنی ئەم چەشنە پیشەسازییەن لە کوردستاندا. بۆ ئەم ئامانجە حەمە پاشای کۆرە وەستا ڕەجەبی کوردی ڕەواندزی بۆ فێربوونی ئەم پیشەسازییە ناردە ئەوروپا، ماوەیەك لەوێ مایەوە ئینجا لەساڵی (١٨١٥) کارخانەی شیرو خەنجەرو تفەنگو لوولە تۆپو گوللە دارشتن و زەرەنگەری و دارتاشی دامەزراند. ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێت ئەوەیە کە سکەی پارەی زێڕو زیوو پاقژی میرنشینی سۆران کە بەناوی میری مەنسوور حەمە پاشای گەورەو بوو، هەر لەو کارخانەیدا لێ دەدرا.

لەهەموو شارەکانی کوردستان سابوون بۆ شارو دێ بەرهەمێکی ناوچەیی بوو و لە ماڵاندا دروست دەکرا، ئەو بنەماڵانەی کارخانەی سابوونیان لە ماڵەوە هەبوو بە سابوونچی ناسرابوون. لە سولەیمانی گەڕەکی سابونکەران هەیە. ئەم گەڕەکەچییە؟ هەر لەگەڵ ئاوەدانکردنەوەی شاری سولەیمانیدا، پاشاکانی بابان بایەخێکی زۆریان بە دروستکردنی سابوون دەدا، ئەوەبوو سابوونچییەکان هەموویان

لەگەڕەکێك کۆبوونەوەو ناوی گەڕەکەکەیان نا (سابونکەران) ئەم ناوە تا ئێستا ماوەتەوە.

وە نەبێت بەرهەمی سابوون لەم ماڵانە هەر بەشی شاری سولەیمانیو ناوچەی سولەیمانی کرد بێت، بەڵکو بۆ گەلێك شوێنی کوردستانو دەرەوەی کوردستانیش دەچوو. بازرگانەکان بەرهەمی ئەم ماڵانەیان دەکڕیو لە خانەکاندا کۆیان دەکردەوە، ئینجا بە کاروان دەنێررا بۆ بەغداو موسڵو حەلەبو دیاربەکرو تەوریز. هەر ئەو کاروانانە لەو سەر گەڕانەوەدا کووتاڵی بازرگانیو عەترو شەکرو چایان بار دەکردو دەهاتنەوە.

مووتاوی یان (موتابچێتی) یەکێکە لە پیشە بەناوبانگەکانی کوردستان، لەزۆر کۆنەوە لەشاری سولەیمانیو کۆیەو کەرکووكو سولەیمانیو هەمەدانو سنە ئەم پیشەسازییە باو بووە. بەرهەمی موتابچێتی بریتییە لە خەراری شاش بۆ تووتنو خەراری سفت بۆ دەغڵو دان.

گەورەترین کارگەی ئەم پیشەسازییە لە سولەیمانی بووە، کە هەموو کات پازدە تا بیست کرێکار کاری تێدا کردووە، ژنانیش لە ماڵاندا بەتەشی موویان بۆ ئەم کارگانە دەڕست.

لەسەردەمی ئێستادا نە کوردو نەتەوەکانی تر ئاتاجی ئەوە نین سابوون لەسەر شێوەی کۆن دروست بکەن، بەلام لە چەرخی ئەلیکترۆنو ئۆتۆمو چوونە سەر مانگو ئەستێرەکان، دەبێت

پیشەسازیی کۆنی نەتەوایەتی وەکو مافوورو قەڵەمبڕو جاجمو ڕانکو چۆغەو کلاشو کەوچکی دار دروست کردن هەر بمێنێتەوە.

## لێکدانەوەی وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| پیشەسازی | : | سەنعەت کاری. |
| ناوبرێشك | : | دارێکی نووك تیژە، نیو مەتر زیاترە بۆ وەرگێرانی نان لەسەر سێل (ساج) بەکاردێت. |
| کەلو پەل | : | پەرتویلك. |
| بەرماڵ | : | سوجادك. |
| قەڵەمبڕ | : | چەقۆی بچووك. |
| ڕوخسار | : | مەظهر. |
| چەخماخ ساز | : | تفەنگساز. |
| فەرمان ڕەوایی | : | حوکم. |
| موزەخانە | : | مەتحەف. |
| پاقر | : | جۆرە مەعدەنێکە، جۆرە کانزاییێکە. |
| سفت | : | عەکسی شاش، واتە ورد چنرابێت. |
| ئاتاج | : | پێتڤی (موحتاج) |

## گفتوگــۆ:

١. چی تر لە پیشەسازییەکانی نـاو کـوردەواری دەزانیـت بۆمـانی بـاس بکە؟

٢. جیاوازی چییە لەنێوان پیشەسازیی گشتیو پیشەسازیی خۆماڵیدا؟

٣. ئامرازی جووت کردن لە گەلێك ئامراز پێـك هـاتووە، ئایـا دەتوانیـت ناوەکانیان بڵێیت؟

٤. چی لەبارەی وەستا ڕەجەبی ڕەواندزییەوە دەزانیت؟

لە دەرسی داهاتوودا نووسینێکمان بە دوو لاپەڕەیەك لـەو بارەیـەوە بۆ بنووسە.

٥. دوو دێڕ شیعر بڵێ کە وشەی (خەنجەر)ی تێدا بێت.

٦. بەراووردی سابوون دروست کردن بکە لە ئێستاو کۆندا.

# میکرۆبێن دۆست

دیاره هەر ژ دەسپێکی دێ حێبەتی بی ژ ڤێ ئاخفتنێو دێ بێژی مەهەر میکرۆب ب دوژمن گولێ بوویە. ئەڤ میکرۆبێن دۆست چنەو ژ کیڤە پەیدا بووینە. ڕاستە ناڤێ میکرۆبی ب خرابی چوویەو هەر دگەل ناڤ ئینانا وی ئێکسەر نەخۆشی دهێنە بیرامە. بەلێ هەر چەندە جۆرەکێ میکرۆبا دخرابنو دبنە ئەگەرێ نەخۆشێن کوژەکو ترسناك. بەلێ جۆرەکێ دی یێ میکرۆبا نەخۆشی لاوازو بێچارە دکەن. ئەم دەمێ ناڤێ میکرۆبا دئینین دەمل دەست کۆلێرە، ئێشا زراڤ، تایا گران، یان نەخۆشیێن دی ژ ڤی بابەتی دهێنە بیرامە. ئێدی ئەو ناهێتە بیرامە کو میکرۆب یێ هەی هاریکاریا گڤێرینێ دەکەت. یان میکرۆب یێ هەی بارستێ خوازێ دهەلوەرینن، هەکە ئەڤ میکرۆبە نەبانە، نە ئەو خواردن دهەلوەریانو کەسەك ژی نەدشیا بخۆت ئەڤ میکرۆبێن ژ ڤی بابەتی ب ڕەنگێ بەکتریاو پەمبلوکو هێڤێنی دایە. هەروەسا هندەك میکرۆبێن دی یێت هەین هێشتا بو زانا دیار نەبوویە کا چنەو چ نینن.

ئەرێ ل ڕێزا گیانداران یان بێ گیانانە یان نیڤ یان نیڤ ب نیڤ؟ ئەڤێ چەندێ ژی دبێژنێ (ڤایرۆس)، کو دبنە ئەگەرێ هندێ ڕووەکو زیندەوەرو مرۆڤی تووشی گەلەك نەخۆشیا بکەن. ڕووەك تووشی نێزیکی سێ سەد، زیندەوەر تووشی نێزێکی شێست، مرۆڤ ژی تووشی پتر ژ شێست نەخۆشیا دبیت، ژوان نەخۆشیێن مرۆڤی پێ تووش دبیت خۆریكو سوورکو پەرسیڤو فالیخا زارۆکانە. مرۆڤی گەلەك ل ڤان

میكرۆبا ڤەكولییە، بۆ هندێ دابگەهتە ڕهـ وریشالێن وی‌و بشێت ژناڤ ببەت‌و نەهێلیت ببنە جهێ نەخۆشییێ‌و دەردەسەرییێ.

زانست دڤێ مەیدانێدا سەرکەفت‌و سەروان ڕەنگێن میكرۆبا زالبوو ئەوێن دبنە جهێ نەخۆشییێ كارەك كر كو مرۆڤ ژێ نەترسیت‌و ڤەنە جنقیت‌و هەر دگەل سەرهەلدان‌و پەیدابوونا وان دا دەمل دەست ژ ناڤ ببەت‌و نەهێلن بەلاڤە بن. گەلەك پسپۆر د ڤێ بیاڤێ دا پەیدابوون، نەك هەر ئەو بتنێ بەلكی زانستێ بەكتریاو پەمبلوك‌و ڤایرۆس‌و ئەڤ بابەتە ژی پەیدابوون. بۆ نوكە ژی ب پشت ڕاستی ڤە دێ شێین بێژین كو زەمانی دەردگرتن‌و پەژیك‌و قڕیوونێ نەمایەو ئەو ژی نەمایە كو د دەمەكێ كێمدا ملیونەها كەس قڕ ببن‌و چ ژێ نەمینیت‌و ژناڤ بچن. نوكە مرۆڤ ب دەرزی دانانێ خۆ ژ ڤان بەلا ڕزگار دكەت. ئێدی بۆ سالەكێ بیت یان بۆ چەند سالان یان ب درێژیا ژیانێ ئەو ڕەنگێن نەخۆشیا نێزیك نابن.

نوكە بلا بێینە سەر دەسپێكا سوحبەتا خۆ و بزانین ئەرێ میكرۆبێ دۆست هەیە؟ یان ب ڕەنگەكێ ڕوونتر بێژین ئەرێ ڕاستە كو ژیان بێی میكرۆب پێك ناهێت‌و ناچتە سەری؟ یان ئەو رۆلی مەزن چییە یێ كو ئەڤ میكرۆبە د خواردن‌و ڤەخوارنێ‌دا و چاندن‌و پیشەسازییێ‌دا دگێڕن‌و دبنە جهێ ژیانێ؟!.

ب ڕاستی‌و دجهێ خۆدا بوو كو زانایەك ژ ئەنجامێ ڤە كولینەكا دوورو درێژو زانستیانە ل ئەمریكا، ئەو چەند دیار كریە كۆمیكرۆبێ زیاندار بەرامبەر میكرۆبێ بێ زیان ژ سێ هزارا ئێكە. بەلێ زەلامەكێ خراب بەرامبەر زەلامەكێ باش لە جیهانێ ژ یازدە هزار ئێكە هەمی زیندەوەر

دمرن، هوین باش سەحا هەر ڕووەکەکی یا زیندەوەرەکی یان مرۆڤەکی بکەن، دێ بینن ژیانا وان ژ شانەکێ دەست پێ د کەتو پێشڤە دچیت، هەر زیندەوەرەك چەند دەمژمێرەکا یان چەند ڕۆژەکایان چەند حەفتیەکا یان چەند سالەکا دژیت. هندەك زیندەوەر ژی یێت هەین وەکی کویسەلەی ژیێ وی خو ل دووسەد سالان ددەت. هەر وەسا هندەك دار ژی بێت هەین وەك دارا (سکۆیا) چەند هەزار سالا دژیت. هەر زیندەوەرەك دەمی دمریت ب ملیونان بەکتریا هێرشێ دبەنە سەرو لەشێن وان پرت پرت کەنو کەونە خواردن بۆ وان زیندەرێن ساڤا ئەوێن ژ نوی وەرارێ دکەنو پێ دگەهن. هەکە ئەڤ میکرۆبە نەبانە. ل وێ ڕۆژا ژیان لسەر ئەردی پەیدا بوویو هەتا نوکە لەشێن مریدا د جهدا مینن. ئەڤجا دەشتو چیاو ئەرد هەمی دا پڕبن ڕێ بۆ ڕێوباری نەدبوو. ئەڤە ژ لایەکی، ژ لایەکێ دیڤە ب هزاران رەنگێن زیندەوەرو ڕووەکا وەرار نەدکرو مەزن نەدبوون، نە بەلکی ژیانا وان دا کەفتە د زڤرۆكو گەریانێ داو دا ڕاوەستییێت، چنکو ب ڕاستی ئەو میکرۆب ڕۆلەکێ ئێجکار دگێرن بۆ هندێ کەرەستێ ئالۆز وەك پرۆتینو روینو کاربۆهیدرات بکەنە کەرەستەکێ سڤكو وەلێ بکەن کو شتلا ساڤا بشێت وان بمێژیتو وەرارێ پێ بکەت. هەر ژبەر ڤێ ژی دێ شێین بێژین ئەڤ میکرۆبە ئاخێ قەلەو دکەتو هەردەم دێ تێڤلەکێ نوێ دەنێ بۆ هندێ دا ئەو زیندەوەرێن ژ نوێ سەری هلدەن پێ بژین. بەلێ ئەڤ میکرۆبە جارەکێ بتنێو میکرۆبەك بتنێ، زیندەوەرو ڕووەکا نا حەلوەرینن. بەلکی ب چەند جاراو هەر جار ژی کۆمەکا میکرۆبا ئەڤی کاری بجهـ دئینن، ئانکو

دێ کەنە خوێ یا سادە یا کانزای وەك ئازۆتو کبریتاتو فۆسفاتو نشاو ئاڤێ. پاش دووەم ئۆکسیدێ کاربوون دێ بلند بیت. ڕووەك دێ لسەر دووەم ئۆکسیدێ کاربوونو ئاڤێو لبەر تیرۆژکا هەتاڤێ جارەکا دی کەرەستێ ئالۆزو ڕەق دروست دکەتو ئێدی ب ڤی ڕەنگی ژیان دێ گەریێت. ئەڤەژی هەر وەکی دەستورەکێ ژیانێ وەسایەو ڕێژا دووەم ئۆکسیدێ کاربوون دێ ب نەگۆڕی مینیتو دبنە نێزیکی ٠,٣ % د هەوایێ ئاساییدا. هەر وەسا پرۆتین ژی ب ئەگەرێ کۆمەکا میکرۆبێن تایبەت دێ هەلوەریێت، هەر دێ هەلوەریێت، هەتا دبیتە ئازۆت، ئەڤ ئازۆتە ژی، لنك ڕووەکی گەلەك خۆش دبیتو دێ مێژیتو پێ ژیت. بەلێ هەکە برۆتین هەر وەکی خۆ ب پروتین ما، ڕووەك مفای ژێ نابینیت، نەبتنێ هەر ئەو بەلکی رووەکا ژی دێ ژنافبەت. هەکە وەسابیت، ئەڤ میکرۆبە بێ گومان دۆستن‌و خزمەتەکا مەزن بۆ مرۆڤی کەن‌و دێ مفایەکێ مەزن ژێ گەهینن، ئەڤ میکرۆبێن دۆست بێدەنگو هێدی خزمەتەکا مەزن بۆمە دەکەن. زانایان بخۆ ژی ئەڤە نەدزانیو ل ڤێ دوماهیێو پشتی ژیان ب سەدان هزار سالان بەردەوام بووی، پاش ئەڤ ڕاستیە بۆ وان خویا بوو.

هندەك جۆرێن بەکتریا یێت هەین د قەلەوکرنا زەڤییێدا دەورەکێ مەزن دگێڕن هێڤێن‌و بناڤو دەنگترین میکرۆبە کو د خواردن‌و ڤەخوارنا مە دا بکار دئینین، ئەرێ ئەو نانێ د خوین ب هەڤیر ترش ناهێتە دروست کرن؟!.

دیسان هندەك خواردن یێت هەین، هەکە هێڤێن نەبایە دروست نەدبوون. هەر وەسا مەی ژی ب هێڤێنی دهێتە دروست کرن، پەنیرو ماست ژی یان بۆ مەیاندنێ یان بۆ تام خۆشکرنێ هێڤێن دڤێت، هەروەسا سهك ژی پێدڤی ب هندەك مێکرۆب هەیە و ب وان میکرۆبا ترشوکا سهکێ دروست دبیت.

بۆ بابەتێ جلکا دیارە وێ دزانین کو کەتان ئەڤ ڕەنگێن تشتا ب ئەگەرێ کارتێکرنا میکرۆبێ تایبەت دهینە چێکرن، چنکو ئەو میکرۆب تایبەتییەو هندەك ژ وان کەرەستا د هەلینیت ئەوێن ڕها ب ڕووەکی دنویساند. ئەڤ میکرۆبێن دۆست هەر ب ڤان خزمەتا نەڕاوەستان، بەلکی گەلەك پیشەسازێن دی یێت هەینو ب ئەگەرێ ئەڤانە د هێنە بجهـ ئینان، بۆ نموونە بەخراپتر یا وان ترشوکا ئەوێن بۆ ڕەنگ کرنێ بکاردهێن، هەر وەسا گەرماردانا پیستیو بۆیاغکرنو ڕیشالێن دەستکردو گولاڤ و مەرەکەبو لاستیکێ دەستکردو گلیسرینو گەلەك ڕەنگێن دی. میکرۆبێن دۆست ل ڤان هەمی پیشەسازیاندا بۆ هندێ کو تێکەلێ بوونەکا کیمیاوی بساناهی دکەن. خزمەتەکا مەزن دگەهینە مرۆڤ. بەری دوماهییێ ب سوحبەتا خوبینین، بە فەردزانین کو پیچەکێ بەحسێ وان میکرۆبێن دۆست ژی بکەین ئەوێن گەلەك نەخۆشیو دەرد ساغ کرین وەك پەنسەلین، سترۆپتۆمیسینو کلۆرومیسینو ئۆرۆمایسین. ئەڤە ژ هندەك بەکتریاو هندەکێن دی ژ پەمبلوکی د هێنە ڤەگرتن، نوکە ئەڤە ب ڕەنگەکێ ئێجگار بەرفرەهـ بۆ تیمارکرنێ دهێنە بکارئینان، مرۆڤایەتی لـژێر سیبەرا ئەڤان ژ دەست گەلەك نەخۆشیان ڕزگاربوویە. ل ڤێ

دوماهیێ زانست شیا ب ڕەنگەكێ بەرفرەهـ ئەڤان درمانا چیكەت‌و ب وی ڕەنگی كو هەمی كەس ل هەر قولاچ‌و كوژیەكێ جیهانێ دابن، بساناهی بدەست بكەڤیت‌و ل بازاری وەك ئەسپیرین دهێنە فرۆشتن. قوتابیێن خۆشتڤی. دیارە نوكە هوین تێگەهشتن كو ئەڤ میكرۆبە دۆست‌و ئەم لسەر هەقیێ بووین، كو مەهۆسا ناڤ لێ نای، ژیان‌و ژیار ب ئەگەرێ ئەڤانەیە، ڕاستە ئەو زیندەوەرەكێ بچویكن، بەلێ خزمەتاوان گەلەك مەزنە.

## شرۆڤەكرنا پەیڤان ( لێكدانەوەی وشەكان )

حێبەتی : سەرسوڕمان.

دەمل دەست : دەم‌و دەست.

گڤێرینێ : هەرس كردن.

د هەلوەرینن : خاو دەكات.

پەمبلوك : كەڕوو.

هێڤێن : هەوێن، هێوێن.

خوریك : ئاولە، خوروكە.

سوورك : سورێژە، سۆركە.

پەرسیڤ : پەسیوو.

رەهەوریشالێ : بنج‌و بناوان، ڕەگ‌و ریشە.

ڤەنە جنقیت : نەسلەمێتەوە.

ئێشا زراڤ : سیل.

پشت ڕاستی : دڵنیابوون.

| | | |
|---|---|---|
| پەژیك | : | پەتا. |
| دەرزی دانان | : | کوتان. |
| زیاندار | : | زیان بەخش. |
| زەلام | : | پیاو. |
| دەمژمێر | : | سەعات. |
| کویسەلە | : | کیسەڵ. |
| ساڤا | : | کۆرپە، ساوا. |
| چەریت | : | دەلەوەرێت. |
| تیرۆژك | : | تیشکی خۆر. |
| مفا | : | سوود. |
| بتنێ | : | بە تەنیا |
| خویا بوو | : | دەرکەوت. |
| هەڤیر ترش | : | هەوێن، هەویری ترش. |
| مەیاندن | : | مەیین. |
| دحەلینیت | : | دەتوێنێتەوە. |
| نویسا | : | دەنوساند. |
| بەهراپتر | : | زۆربە. |
| گەماردان | : | پێستە خۆشك کردن. |
| قولاچو کوژی | : | کەلو قوژبن. |
| سهل | : | سرکە. |

# شاعيرو نەتەوە

ئەو گولاڵە سوورەی لە بەهاراندا بەسەر پێ دەشتو هەردەو هەڵەتو دۆڵو دەرەو قەدپاڵەکاندا ناز دەکات، ئەوەندەی پێ ناچێت دەژاکێتو سیس دەبێتو دەبێتە پووشو پەڵاش، بەلام لە شیعری شاعیرەکاندا هەر گوڵاڵەیەو هەر نازی خۆی دەکاتو هەر دەشنێتەوە، ئەو ساتەی شیعرەکە دەخوێنیتەوە گوڵاڵەکە کوتومت وەکو خۆی دێتە بەرچاووتو وا دەزانیت هەڕەتی بەهارەو سەرنج لە خەرمەنی گوڵاڵە دەدەیت.

زەردەخەنەی سەر لێوی منداڵ تا بڵێیت دڵگیرەو مایەی مووچڕکی خۆش خۆشە بە لەشدا بەڵام هەر تەنیا هەنیسکێکی بەسە بۆ ئەوەی وەك لافاو بێتو لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچی بکات، کەچی ئەو زەردەخەنەی سەر لێوی منداڵە لە شیعری شاعیرەکاندا هەمیشە نەمرەو لەبەر چاوە.

شاعیر ئەم هەستە ناسكو ئاوادارەی خۆی بەزمانی نەتەوەیی دەڕژێنێتە سەر کاغەز، هەر ئەوەندەشی بەسە کە دەڕژێتە سەر کاغەز ئیتر کوژاندنەوەی نییەو تا دنیا دنیایە هەر دەمێنێت. تەنانەت ئەو شیعرانەش کە ئاوازی مرۆڤایەتیو خێر خواهی قووڵ دەکەن، ئەو شیعرانەش کە ئاوازی ئاشتیو ئاسایش دەدەن بە گوێی خەڵکدا، گشتی هەر بەزمانی نەتەوەیی دەبێژرێن، بۆیە لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین کە شاعیری چاكو باش دەتوانێت بە شیعرەکانی خزمەتی گەورەی نەتەوە بکات، چونکە (ئەدەبی بە پیتو بەلەزەت زمان لای کەسانی میللەت خۆشەویست دەکاتو ڕۆژبەڕۆژ هۆگری دەبنو شانازیی پێوە دەکەن، من زۆرجار گوێم لێ بووە کە یەکێك گوێی لە شیعرێکی باشی گۆران، یا

پیرەمێرد، یان هەردی، یان هێمن موکریانی بووە، بە قوربانی ئەو زمانەش بووە کە ئەو شیعرەی پێ وتراوە، دیارە ئەم بە قوربان بوون‌و شانازیی ئۆتۆماتیکی دەبێتە بە قوربان‌و بوون‌و شانازی بە میللەتەکەوە، کە ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی کە دەوترێت شاعیرو ئەدیب لە ڕێگەی خزمەتی زمانەوە، خزمەتی گەورەی نەتەوە دەکەن)[1].

شیعری نەتەوەیی کوردیش دەوری باڵای خۆی لە مێژووی نەتەوەیی کورددا دیوە، لەگەڵ ئازارو ئاواتی میللەتەکەدا بووە، خەڵکەکەی وریا کردۆتەوە، دەستی خستۆتە سەر برینەکانی میللەت‌و هانی هوشیار بوونەوەو ڕاپەڕینی داون. ئاگاداری کردوون کە کڕنووش نەبەن، کە مل نەدەن بۆ سەرشۆڕی‌و ژێر دەستی کە ئازادیخوازبن‌و ڕزگاری پەرست.

ڕەسەنی شاعیری نەتەوەیی لەوەدایەکە گیانێکی هونەرمەندانەی هەیە، لەگەڵ خۆی‌و لەگەڵ خەڵکدا ڕاستگۆیە، خۆشیی کەمەو خەمی زۆر، زۆر کات پەستەو زۆر کەمیش دڵخۆش، ئەم ڕەسەنی‌و ڕاستگۆییەی شاعیر بووە بە مایەی برسێتی‌و حەپس‌و تێهەڵدان‌و دەربەدەری‌و شاعیری ڕەسەنی نەتەوەیش هەر دەبێت وابێت، لە مەیدانی سیاسەتدا ڕۆڵەیەکی بە جەرگ‌و خەبات کەرو شاعیرێکی ڕاستگۆ بێت. دوو تووێی شیعرەکانی پڕ بێت لە ئازارو ئەشکەنجەی گەل‌و شۆڕشی گەل‌و مژدەی دوا ڕۆژو بڕوای بەهێز بەنەتەوە خۆشەویستەکەی خۆی.

(لەسەر شێوەی (الشاعر والامة)ی لەناو پەرتووکی خوێندنەوەی عەرەبی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی داڕێژراوە)

---

(١) چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی شاعیر، نووسینی فەرەیدوون عەلی ئەمین.

# گالیلۆ

٣٠٩ ساڵ لەمەوپێش، واتە لەساڵی ١٦٣٣دا، دادگای تەفتیش لە شاری ڕۆما لە ئیتالیا حوکمی دا بەسەر گالیلۆدا، چونکە باری سەرنجو تیوورەکەی (کۆپەرنیکۆس)ی پەسەند کردبوو کە وتبووی، گۆی زەوی بە دەوری تەوەرەی خۆیدا دەسووڕێتەوە.

ئەمڕۆ ئەگەر بە منداڵێکی قوتابیی قوتابخانەی سەرەتایی بڵێن: (گۆی زەوی لەجێی خۆی وەستاوەو ناجووڵێت، خۆر بە دەوریدا سووڕ دەخوات) گاڵتەو قەشمەریمان پێ دەکات، چونکە ئەمڕۆ لای هەموو کەس ئاشکرا بووە کە گۆی زەوی بە دەوری خۆیو بەدەوری خۆردا دەسووڕێتەوە. بەڵام پێشینیانو زانایانی ئەو سەردەمە وایان دەزانی کە زەوی لەجێی خۆیدا وەستاوە. ڕۆژو مانگو ئەستێرەکان بە دەوریدا دەسوڕێنەوە.

لەسەد ساڵەی پانزەهەمی میلادیدا، زانای بەناوبانگ (کۆپەرنیکۆس) دەستی کرد بە تێگەیاندنو بڵاوکردنەوە لەناو خەڵکدا: کە زۆر بە هەڵە چوون، کە دەڵێن. گۆی زەوی لەجێی خۆی وەستاوە. بە پێچەوانەی تێگەیشتی خەڵکی ئەو زەمانەوە سەلماندی کە زەویو مانگو هەندێك لە ئەستێرەکان بە دەوری خۆردا دەسوڕێنەوە، ئەم بۆچوونو تیوورەی کۆپەرنیکۆس لەناو خەڵکدا دەنگی دایەوەو بڵاوبووەوە.

ئەگەر کۆپەرنیکۆس تا زەمانی گالیلۆ بژیایە، بێ گومان موحاکەمەی ئەو دەکەوتە پێش موحاکەمەی گالیلۆوە.

گالیلۆ لەساڵی ١٥٦٤دا لەشاری (پیزا) لە ئیتالیا هاتۆتە دنیاوە. لە زانستی ڕیازییاتو فەلەكو فیزیكدا زۆر پێشكەوتبوو، هەموو جیهان قەرزاری توانای ئەم زانا خۆشەویستەیە كە (تەرمۆ مەتر)و (تەلیسكۆب)ی دۆزییەوە، ئەم دوو شتە بەری تێكۆشانی ئەم زانا گەورەیەیە كە لەهەموو تێكۆشانو تاقیكردنەوەیدا لەسەر ڕەوشتی كۆپەرنیكۆس دەڕۆیشتو بەناو خەڵكدا بڵاوی دەكردەوە. ئەم كردەوەیەی گالیلۆ لەناو پیاوانی ئاینو زانایانی ئەو سەردەمەدا وەك بۆمبایەك تەقیو لێی كەوتنە تەقو پیاوانی ئاین لە ڕۆما بەگژیدا چوون، بڕیاریاندا كە گالیلۆ كافرو زەندیقو بێ ئیمانە. بەم جۆرە (پاپا)یان لێ هاندا كە فەرمانی دا دەبێت گالیلۆ لەم بیرو باوەڕە هیچو پووچو پڕو پووچەی خۆی وازبهێنێتو نابێت لە زانستگاكانی ئیتاڵیادا دەرس بڵێتەوە. گالیلۆ ناچار بوو واز لە تێكۆشانی ئاشكراو بڵاوكردنەوەی بیرو باوەڕی خۆی بهێنێت، چونكە ڕقەبەریی پاپاو میرنشینەكانی ئیتالیای پێ نەدەكرا. جارێكی تر لە ساڵی ١٦٣٢دا بیرو باوەڕو تیوورییی خۆی ئاشكرا كردو، وتی ناتوانم بەرامبەر ڕاستییەك بێ دەنگ ببم كە زۆربەی خەڵكی بە هەڵە بۆی چوونو تێی گەیشتوون، پەرتووكێكی لە چاپداو بڵاوی كردەوە، لەوەدا تیوورەكەی كۆپەرنیكۆسی پەسند كرد.

دوژمنەكانی كە زانیان پەرتووكەكەی دەستاو دەست بڵاوبۆتەوە، دەستو برد كەوتنە جووڵەو كارێكی وایان كرد نووسەرەكەی حەواڵەی (دادگای تەفتیش)، واتە (دادگای جەزای پاپا) بكرێت. چونكە ئەم كردەوەیان بە كفردایە قەڵەم. لەو زەمانەدا حوكمی كەنیسەو پاپا

بەسەر هەموو خەڵکداو تەنانەت بەسەر قەراڵو میرەکانی ئەوروپاشدا زاڵ بوو، گشت جیهانی کریستیان گەردن کەچی پاپا بوون. بەم جۆرە ئەم زانا پیرە خۆشەویستە لەتەمەنی ٧٥ ساڵیدا بۆ دادگای تەفتیش راپێچ کرا، موحاکەمەکەی ٢٠ ڕۆژی خایاند، دۆستەکانی گالیلۆ وایان چاوەڕوان دەکرد کە گالیلۆ بەرگریی تیوورەکەی خۆی بکاتو بیسەلمێنی کە ڕاستە، بەڵام وای نەکرد چونکە دەیزانی کە بەرگریو قسەکردن بەرامبەر بەو بێ مێشکانەی کە رازی نەبوون مەسەلەکە حەواڵەی دادگای جەزای مەدەنی بکرێت بێ سوودە، چونکە ئەو بێ مێشکانە دەیانزانی ئەگەر حەواڵەی ئەوێ بکرێت، گالیلۆ دەتوانێت تیورەکەی خۆی بە ئەندامانی دادگا بسەلمێنێ. هەر بەوەشەوە نەوەستان بەڵکو زۆریان لێ کرد کە بەرامبەر خەڵك ئاشکرای بکات کە بیرو باوەڕو تیوورەکەی چەوتەو لەگەڵ نەریتی کەنیسەدا ڕێك ناکەوێتو ناگونجێت، چونکە کتێبە پیرۆزەکانی (ئینجیل) کەمو زۆر باسی ئەوە ناکەن کە زەوی بە دەوری تەوەری خۆیدا یان بە دەوی خۆردا بسوورێتەوە، دەیان ووت: ئەم تیووره نارێکیو چەوتییەك بە یاسای زانستی فەلەك دەداتو یاسای دنیاش شلۆق دەکات.

گالیلۆ تەنگەتاو کرا کە تیورەکەی خۆی بەئاشکرا بە درۆ بخاتەوە، ئینجا گالیلۆ لەسەر چۆك راگیرا بوو کە نامەی بەدرۆخستنەوەی تیوورەکەی خۆی درایە دەست بۆ ئیمزا کردن، دەمو دەست ڕاپەڕیو هەستایە سەر پێو بە هەموو هێزی خۆی پێیدا بە زەویداو قیژاندی: ((لەگەڵ ئەمەشدا هەر لە سووڕانەوەدایە)). مەبەستی گالیلۆ ئەمە بوو

کە تێیان بگەیەنێت هەر چەندە ئینکار نامەی تیورەکەی بەزۆر پیێ ئیمزا دەکەن، بەڵام گوێ زەوی لە سووڕاندنەوەی خۆی نەکەوتووەو ناکەوێت.

دادگای تەفتیش بڵاوی کردەوە کە گالیلۆ لە دادگادا دانی بە تیوورە چەوتەکەی خۆیدا نا لەبەر ئەوە بڕیار درا کە لە خانووەکەی خۆیدا لە (ئەرستری) دەست بەسەر بێت، بەمەرجێك لەمەولا بیرو باوەڕو تیورەکەی خۆی بەهیچ کەس نەڵێتو تیورەکەی کۆپەرنیکۆسی بەسەر زماندا نەیەت. ئینجا دادگای تەفتیش بەهۆی جاسووسو پۆلیسو قەشەکانەوە چاودێریو سەرپەرشتیی گالیلۆی دەکرد.

ئەم پیاوە خۆشەویستە، زۆر بە کەساسیو هەژاری دوا ڕۆژی ژیانی خۆی ڕابوارد. لەساڵی ١٦٣٤دا کچە خۆشەویستەکەی مرد، جەرگی بڕا، هەستو هۆشی نەما، لەساڵی ١٦٣٦دا نەخۆش کەوتو هەردوو چاوی کوێر بوو، لەساڵی ١٦٤٢دا لەو خانووەدا کە دەست بەسەر بوو، مرد، ئەمە ساڵی سێ سەدەمینی مردنی گالیلۆیە، ناوی گالیلۆ وەك بڵیسەی یادگارێك لەناو کۆڕی زانستو کۆمەڵێ زانایاندا هەرگیز ناکوژێتەوە.

مەسەلەکەی گالیلۆ لەو مەسەلانەیە کە زۆرداریو نادانیی زۆر بە زەقی تیادا دیارە. لەو جۆرە هەڵانەی دادگایە کە زۆر جار دادگاکان پێیان تیادا هەڵدەخلیسکێت، یان لەو جۆرە ڕووداوانەیە کە زۆرجار دادپەروەری دەکەوێتە ژێر پێ لەقەی غەرەزی شەخسییەوە.

زۆرجار ڕێ دەکەوێت کە دادپەروەری لەژێر پەردەی تەماعو ناپاکیدا دەشاردرێتەوە، چرای ڕاستیو سەربەستیو ئازادی لەژێر هێزی پارەشی ناهەقیدا دەکوژێتەوە !.

لـــەگۆڤاری گەلاوێـــژی ژمـــارە ٩-١٠ ســـاڵی ٣ی ١٩٤٢وە بـــە دەستکارییەکی کەمەوە وەرگیراوە.

## لێکدانەوەی وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| لێی کەوتنە تەقە | : | گازاندەیان ژێ کر. |
| دەستو برد | : | بزاڤ . |
| نەریت | : | عادەت. |
| یاسا | : | قانون. |
| هەڵە | : | غەڵەت. |
| پێ لەقە | : | پەحین. |

## گفتوگــۆ:

١. کۆپــەرنیکۆسو گــالیلۆ کــێ بــوونو دەربــارەی تیورەکــەیان چــی دەزانێت؟
٢. ئایا ئەو مەحکەمەیەی کە بۆ گالیلۆ دانـراو نـاوی دادگـای تـەفتیش بوو، لەلای تۆ خۆیو حوکمەکەی ڕەوا بوو؟ بۆچی؟
٣. ئایا دەتوانیـت نـای چـەند کەسـانێك یـا ڕووداوێـك کـەوا بـەم جـۆرە حوکمی ناهەق بەسەریاندا درا بێت باس بکەیت؟

# لەناوبردنی نەخوێندەواری هەنگاوێکی بوێرانە بۆ بنیاتنانی مرۆڤی نــــوێ

# بەرهەمی زۆرو بەشکردنی بە هەقیانەت

وا دەگێڕنــەوە کــە (بەرناردشــۆ)ی نووســەری بــەناوبانگی ئینگلیــز، جارێـك لــە ئاهەنگێکـدا چـاوی بــە یــەکێك لەســەرمایەدارە گــەورەکانی بەریتانیا دەکەوێت، بەڕێکەوت کـابرای سـەرمایەدار قەڵـەوو چوارشـانەو ورگ زل دەبێت، وەك دەزانین بەرنارد شۆش زەردو لاواز باریکەلەو سـەر رووتاوە بووە.

کابرای سەرمایەدار بە (شۆ)ی نووسەر دەڵێت:

- ئەوی تۆ ببێنێت وا دەزانێت، کە لە دوورگـەی بـەریتانیادا برسـێتیو قاتیو نەبوونییە، نە نان دەست دەکەوێتو نەخواردن. بەرنادشـۆی حازر بەدەست کتوپڕ دێتە وەڵامو دەڵێت:

- بەڵام ئەوەی تۆش ببینێت وا دەزانێت کە هۆی ئەو هەموو برسێتیو قاتی نەبوونییە تۆیـتو هەرچـی بەرهــەمو نـانو خـۆراکی دوورگـەی بەریتانیایە تۆ بردووتە بـۆ خـۆتو تـۆ دەیخۆیـتو بەشـی کەسـی لێ نادەیت.

دیــارە ئەمــە قــسەی خۆشــەو دەیگێڕنــەوە، چــونکە مــەرج نییــە سەرمایەدار هەر قەڵەوو زۆر خۆربێت، چونکە زۆرجار هەیـە کـابرا ملیـۆن زێڕی هەیەو لەبەر نەخۆشی، ئەگەر بـەر رژدی نـەبێت، کولێرەیـەکی پـی تەواو ناکرێت.

مەکـسیم گـۆرکیی نووســەری گــەورەی ســۆڤێت، جارێـك دەچـێتە ئەمریکاو حەز دەکات یەکێك لە خاوەن ملیۆنـەکان ببینێـت، گۆرکی لای سەیر بوو کە کابرای ملیـۆنێر زۆر لاوازو ڕیوەڵـەو ڕەنـگ زەردو دان زەرد

بوو، لەبەر نەخۆشی شەکرو چەند نەخۆشی تر هەرچی خۆراکی خۆش هەیە لێی قەدەغەکرابوو، گۆرکی دەڵێت: پێشتر وام دەزانی ملیۆنێر دەبێت پیاوێکی زۆر ئەستووری، چەتەووڵی بە چنگی، دان تیژ بێت. ڕۆژی چەند مریشك‌و عەلیشیش‌و چەند سینی پاقلاوە دەخوات، بەڵام ملیۆنێرم ئاوا دیت، زۆرم بەزەیی پێدا هاتەوە، هێندە ویژدانی خۆی ئازار بداتو هێندە ئازاری خەڵکی بداتو ڕەنجیان بخواتو هەندێك جار بەدەیان هەزار بەکوشت بدات، جەنگ بۆ ئەوە هەڵگیرسێنێت، کە چەك بفرۆشێتو پارەی زۆر پەیدا بکات، بەڵام نەتوانێت هێندەی بچووکترین‌و لاتترین کرێکاری یەکێك لە کارگەکانی، سوود لە هەوڵ‌و لەشی ساغی خۆی ببینێت. گۆرکی لەگەڵ ئێمەدا دەپرسێت، کەواتە: بۆچ کابرای ملیۆنێر ئەم کارە دەکاتو ئەم پارە زۆرەی بۆچییە؟ ڕەنگە ئەم نەخشەو تابلۆیەی مەکسیم گۆرگیش هەر زادەی خەیاڵی خۆی بێت‌و شتێك لە قسەی خۆش‌و گاڵتەو گەپی پێوە بێت. بەڵام ئەمیش‌و ئەو قسە خۆشەش کە لەزمانی بەرناردشۆوە گێڕامانەوە، لە جەوهەردا مانایەکی زۆر قووڵیان تێدایەو دیمەنێکی ڕژێمی سەرمایەداری، ڕژێمی چەوساندنەوەو ڕەنج دان‌و ڕەنج خواردن دەخەنە ڕوو.

کۆمەڵێکی زۆر لە زەحمەت کێشان، لە فەللاح‌و کرێکار ڕەنج دەدەن. چی خێرو بەرەکەت هەیە، بەرهەمی دێنن، جەرگی زەوی دەدڕن‌و دایدەپۆشن‌و ئاوی دەدەن‌و بەهێزو بازوو شەونخوونی، لەسەرمای زستانداو لەگەرمای هاویندا، لەڕۆژانی دڵ تەنگی پایزداو لە شەستە بارانی بەهاردا لەبەرهەم هێنان‌و پاراستنی ئەو بەرهەمە ناکەون. زەوی

پڕ دەکەن لەبەری جوانو شیرین تێرو تەسەل کەری دەستو بازوویان، ئەوان زۆرو بەرهەم زۆر، بەلام ئەو بەرهەمە بۆ کێیەو چۆن دابەش دەکرێت؟

دەمێکە فەیلەسووفانو شاعیران خەو بەوەوە دەبینن کە ئەم بەرهەمە زۆرە، بەسەر ئەو بەرهەم هێنەرە زۆرانەدا دابەش کرێت، هەر کەسە بەشی خۆی بەرکەوێت، ئەنجامو بەری ڕەنجی بۆ خۆی بێت، بەلام کەی ئەو خەوە هاتۆتە دی؟ کەی بووە خاوەنی ئەو ڕەنجو خێرو بەرەکەتە بەداخی بستێ زەویو جۆگەیەك ئاوەوە سەر نەنێتەوە، لە ئازاری ڕەنجداو بە داخی ڕەنجەڕۆییو ڕەنج خوراویی خۆیەوە مالێ ئاوایی نەکات.

مێژوو پێش ڕژێمی ئیشتراکی، هیچ ڕژێمێکی نەدیوە، کە بەرهەمی زۆری، عادلانەو بەپێی ئیش، بەسەر بەرهەم هێنەراندا دابەش بکرێت. ئیشتراکییەت هەر ئەوەنییە کە (دەنکە گەنمی بەپیتو بەرەکەت بکات بە عەمبار)و ئەو عەمبارەش بەڕەزامەندیی هەموو خەلك بۆ زەوی چێن بێت، بەلکو ئیشتراکییەت پلەی بەرهەم هێنانی بەرز کردەوە، لادێ وردە وردە تەکنیکی تازە لە کشتوکالدا بەکاردێنێتو شاری خاپوورو دواکەوتووی جارانیش، ئاوەدانو پێشکەوتووە، نموونەی شارستانێتی تازەیە، پیشەسازی تازەترین بەرهەمی داهێنانی مێشکی مرۆڤی تازە بەکاردەهێنێت. هەموو ئەمانەش مولکی هەموانە، بەری بۆ هەموانە. کۆشكو تەلاری تاقە کەسی سەرمایەداران دەبێتە مولکی گشتیو لەپالێ ئەودا خانوو بەرەو ساختمانی گەورە پەیدا دەبێتو بەسەر کارگەرو بیرو

ڕووناکو هەموو کەسدا، چۆنیەکو بەپێی خێزانو پێویستیی دابەش دەکرێت.

تا دێت نەخۆشی لە کزییەو پزیشکو دەرمانو نەخۆشخانە، چوون یەک بۆهەموانەو بێ پارەو بێ ئەوەی زانست بکرێت بەهۆی گیرفانی پڕکردنو خەڵك ڕووتاندنەوە.

دایەنخانەو باخچەی منداڵو قوتابخانەو خوێندنی بەرزو هەزارەها پرۆژەو کارخانەی گەورە گەورە بۆ هەموانە، بۆ منداڵی جووتیارو کارگەرو فەرمانبەرو بیرڕووناکەو هەموو چۆن یەك پەروەردە دەکرێنو بۆ نیشتمانی بەختیار پێدەگەیەنرێن. ئەمانەش چۆن یەك پەروەردە دەکرێنو بۆ نیشتمانی بەختیار پێدەگەیەنرێن. ئەمانەش هەمووی بەرهەمن، بەرهەمی زۆرو بە پیتن، بە هەقیانەت بەش دەکرێنو بۆ هەموانن، نموونەی ژیانی بەختیاریی خەڵکن. تا کاروانی خەباتی زەحمەت کێشانیش بەرەو پێشەوەتر بڕوات... ئەو بەختیارییە لە زیادییەو قووڵترو هەمەڕەنگ تر دەبێت. هەر ژیانەو کاروانەو سەرکەوتنو شادی... ئاشتی بۆ گەلانو شادیو بەختیاری بۆ هەموو لایەك.

## لێکدانەوەی وشەکان

| | | |
|---|---|---|
| نووسەر | : | نڤیسار. |
| بەناوبانگ | : | بەناڤ و دەنگ. |
| ورگ | : | سك. |
| بەڕێکەوت | : | لەناکاو، ناگاە، ژنشکەکیڤە. |
| زل | : | مەزن. |
| ڕژدی | : | ڕەزیلی، پیسکەیی، بەخیلی. |
| ڕیوەڵە | : | لاواز، زەعیف. |
| قووڵ | : | هوور، هێر. |
| خاپوور | : | کامباخ. |
| دایەن خانە | : | حەزانە (حضانة)، دایەنگە. |

## گفتوگـۆ:

١. ئایا دەتوانیت شتێکی وا بگێڕیتەوە کە لە قسەکەی بەرنادشۆ یا گۆرکی بکات؟

٢. چی دەربارەی بەرنادشۆو گۆرکیێ دەزانیت؟.

٣. بۆچ لەڕژێمی دەرەبەگیو سەرمایەداریدا زۆر جـار ڕێگـە لـە بەرهـەم زۆر کردن دەگیرێت؟

٤. چۆن ئەو بەرهەمە بۆ هەمووان دەبێتو لەچ ڕژێمێکدا؟

٥. چۆن ئادەمیزان ژیانی بەختیاری بۆ خۆی بنیاد دەنێت؟

٦. بـەراوردێك بکـە لـەنێوان ڕژێمـی سـەرمایەداریو ئیـشتراکیدا لـە هـەموو ڕوویەکەوە.

# کۆمەڵی خوێندەوار کۆمەڵێکی پێش کەوتووە

# کەرکووك

کەرکووك یەکێکە لە پێنج شارە گەورەکەی باکووری عێراق‌و چوار شارە مەزنەکەی کوردستانی عێراق، شارێکی گەلێ کۆن‌و دێرین‌و بەناوبانگە، یادگاری ڕۆژهەلاتی کۆنەو لەدێر زەمانەوە ماوەتەوە تاکو ئێستاکە. شاری کەرکووك بە (١٢٦٠) هەزارو دوو سەدو شەست پێ لەڕووی زەریا بەرزە، وە بە (٢٨٥) دوو سەدو هەشتاو پێنج کیلۆمەتر لە بەغداوە دوورە. پانایی ناوچەی کەرکووك (٢٠٨٠٠) بیست هەزارو هەشت سەد کیلۆمەتری چوار گۆشەییە. ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی (٤٦٠٠٠٠) چوار سەدو شەست هەزار کەسە. موحافەزەی کەرکووك لە (٦) شەش قەزا پێکهاتووە:

١. قەزای کەرکووك: بریتییە لە (٥) پێنج ناحیە: قەرە حەسەن، پردێ شوان، تازە، دووبز.

٢. قەزای کفری: بریتییە لە (٤) چوار ناحیە: پێباز، قەرەتەپە، سەر قەلا، جەبارە.

٣. قــەزای تــووز خورمــاتوو: بریتییــە لــە (٤) چــوار ناحیــە: قــادر کەرەم، داقووق، ئامەرلی، سلێمان بەگ.

٤. قــەزای چەمــچەماڵ: بریتییــە لــە (٢) دوو ناحیــە: ئاغجەلــەرو سەنگاو.

٥. قەزای حەویجە: بریتییە لە (٢) ناحیە: ڕیاز، حەویجە.

٦. قەزای کەلار.

بەشی زۆری دانیشتوانی ناوچەی کــەرکووك خــەریکی کـشتوکاڵن، زۆری دەغــڵ‌و دان‌و بــرنج‌و نیــسك‌و نــۆك‌و مــاش‌و کــونجی‌و لۆکــە دەچێنن. بەشێکیش خەریکی شــوانین‌و هەنــدێکی تــریش بــە کــڕین‌و فرۆشــتن‌و بازرگانییــەوە خــەریکن. لەبــەر نــەبوونی سەرچــاوەی مێژوویی تەواو، دیاریکردنی سەردەمی دروستکردنی شاری کــەرکووك کارێکی گەلێك قورسە. لەدوو کتێبی کۆنی کلدانیدا باسی ئــەم شــارە کراوە. لەساڵی ١٨٦٩دا مەتران ئەدی شێر، کتێبێکیانی گۆڕییە سەر زمــانی تــورکی‌و دانــەیێك لــەم کتێبــە ئێــستاکە لــە دێــری کلــدانیانی کەرکووکدایە لە قەڵا. بەڵام کتێبی دووەمیان کە ناوی (دەنگـو باسی شــەهیدو قدیــسان)ە ســاڵی ١٨٩١ قەشــە پــۆلس بێجــانی لــە شــاری لایبزیك بە چاپی گەیانــدووە. وەکــو لــە نــاوەڕۆکی ئــەم دوو کتێبــەدا

دەردەکەوێت پاشای ئاشوری سەردناپالّ فەرمانی ئاوەدانکردنـەوەی شـاری کـەرکووکی داوەو هـەزار کەسـی ئاشـووری لەشـاری تـازەدا نیـشتەجێکردووە. لـەو کاتـەی کـە ئەسـکەندەری مەکـدۆنی ولاّتـی میزۆپۆتامیـای داگیرکـرد، ناوچـەی کـەرکووك بـوو بـە پارچـەیەك لـە خاکی ئیمپراتۆریەتە مەزنەکەی. لەپاش کۆچـی دوایـی ئەسـکەندەر، ولاّتەکەی لەنێوان سێ فەرماندەی لەشکرەکەیەوە دابەشـکرا، شـاری کـەرکووك کەوتـە بـەر سـلۆکس، ئـەم فەرمانـدەرە شـاری کـۆنی رووخانـدو سـەر لـەنوێ دروسـتیکردەوە، شـوورەیەکی گـەورەی لەدەوری شار تەنیو شەستو پێنج قولەو دوو دەرگـای گـەورەی بۆ کرد، دەرگای سەرو ناوی (دەرگای تووتی) بـوو، وە دەرگـای دووەم نـاوی (دەرگـای پاشـا)بـوو. وا دەردەکـەوێت کـە تـووتی دەبێـت یاریدەدەری سلۆکس بووبێو لەپاشانا بووبێ بـە سـەرۆکی شـار، لـە سەردەمی ئەمەدا شـاری کـەرکووك گـەلێ پێشکەوتو نـاوی بـوو بـە (کـەرخ- سـلۆك). لەسـالّی ٢٤٧ی پـێش زایـین فەرایییـەکان شـاری کـەرکووکیان داگیرکـرد، ئەمـە زۆری نەخایانـدو سـالّی ٢٢٦ی پـێش زایین ئەردەشێر تـوانی کـەرکووك لـە فەرایییـەکان وەرگرێتـەوە، بـەم جۆرە ئەم ناوچـەیە کەوتـە ژێـر دەسـتی ئێرانییـەکان تـا سـەردەمی

پەیدابوونی عەرەب لە هەرێمانەدا لە سەردەمی (تەهماسب) قولی خان کە بەناوی (نادرشا) ناسراوە، فەلەیەکی کەرکووکی لەهەندێ لەنووسینەکانیدا ئەم زانیارییانەی دەرختسووە: (لە شەوی ١٦ کانوونی یەکەمی ساڵی ١٧٣٢ تەهماسب شاری کەرکووکی داگیرکرد، لەپێش هەموو شتێکدا قڕانی بە جوولەکەی شار هێنا، وە گەلێکیشی بەدیل گرتن. بەڵام خەڵکی شار پێکەوە بەرهەڵستی ئەم هێرشەیان کردو بۆ ماوەیەکی سێ سەعات بێ وچان لەخەبات نەکەوتن. هەردوولا تووشی زیانێکی بێ سنوور بوون‌و کەسێکی زۆریش کوژران، تەهماسب ناچار بوو شار بەجێبهێڵێت‌و ڕووبکاتە گوندی (قۆریە)کە سەعاتێك لەشار دووربوو. لەپاش ڕوودانی ئەم کارەساتە، خەڵکی شار جارێکی دیکە دەستیان کردەوە بە ئاوەدانکردنی شارو دروستکردنی خانووبەرەیان. ڕۆژ بەڕۆژ شار زیاتر پێشکەوتوو گەورەتر دەبوو. شاری کەرکووکی ئێستا لەدوو بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەمی بڵندایییە کە قەڵای پێدەڵێن‌و بەشی دووەمیشی پانایییە قۆریەی پێدەڵێن. قەڵای کەرکووك ناوچەیەکی ستراتیجی‌و سەختی ئەم هەرێمەیە، لەبەر ئەوە بوو هەمیشە خۆی لەهێرشی دوژمن‌و بێگانە پاراستووە. لەکۆنەوە فەلەکانی کلدانی لە قەڵا

جێنشین بوون و گەلێ خانووبەرەی جوانیان تێدا دروستکردووە. لە بەهاراندا شاری کەرکووك دیمەنێکی ڕەنگاو ڕەنگی قەشەنگ دەنوێنێت، بەتایبەتی دیمەنی دەشتایی خوارەوەو سەرسنگی قەلاکە گوڵ و سەوزایی بەهاری لێدەڕوێت. لە قەلای کەرکووکدا دوو مزگەوتی هەرە کۆن تا ئێستا هەر ماونەتەوە، یەکەمیان ناوی مزگەوتی (ئولۆو) وە مەریەمانەشی پێدەڵێن، دووەمیان ناوی مزگەوتی (دانیال پێغەمبەر)ە. فەلەکان دەڵێن: لە بنجدا ئەم دوو مزگەوتە دێری دیانان بوون، وە گۆڕی حەنانی و عەزاری و میشائیل لەناو مزگەوتی دووەمدان، بەلام جوولەکە دەڵێن: دانیال پێغەمبەر لەو مزگەوتەدا نێژراوە. ئەگەر تەماشای بیروڕای مێژوونووسەکان بکەین دەبینین بە پێچەوانەی ئەم باوەڕەیە، مێژوونووسەکان دەڵێن: دانیال پێغەمبەر لە خۆزستان کۆچی دواییکردووەو لەشاری شووشتەر نێژراوە. تا ئێستا ئەوە نەزانراوە کە لەچ سەردەمێکدا بەشی خوارووی کەرکووك ئاوەدانکراوە، لە دەمی هەندێ لە پیرەکان بیستراوە کە گوایە لەساڵی (١٧٢٩)دا خەڵکی خانووبەرەی لە خوارووی قەلا دروستکردووە, بەستی (خاسە) شاری کەرکووك دەکات بەدوو کەرتەوە، قەلاو هەندێ لە گەڕەکەکانی دیکە

کەوتوونەتــە لای دەســتی چــەپی بەســتی خاســە کــەدیوی ڕێگــای سلێمانی پێدەڵێن، بەڵام لای دەستی ڕاستی، کە ئێستاکە لـەو دیـوە گەورەترە، دیوی قۆریە، یـاخود ڕێگـای هـەولێرو بەغـدای پێدەڵێن. گەڕەکەکانی دیوی قەڵا ئەمانەن:

(میران، حەمام موسلیم، حـەمام مەسـیح، ئاغـالق، ئیمـام قاسـم، زینـدان). بــەڵام گەڕەکــەکانی دیــوی دووهــەم، هــەر بــەناوبانگیان ئەمانــەن: (قۆریــە، شــاترلو، ســاری کەهیــە). لــە کەرکووکـدا گــەلێك خانووبەرەی جـوانو کۆگـاو یانـەو گـازینۆو قوتابخانـەی کـوڕو کـچو بارەگای میریو ئاوو کارەباو نەخۆشخانەو باخو پارکو دامو دەزگـای منداڵانو فرۆکەخانەو ئێستگەی شەمەندەفەرو تەلـەفزیۆن دەبینـرێن. هەروەها شەقامی ڕاستو فراوانو ڕووناك بە تیـشکی کارەبـاو ڕازاوە بە دارو درەخـت دیمـەنی شـاری کـەرکوك بـە شـارێکی تـازە بابـەت دەنوێنێت. لەشاری کەرکووکدا نزیکەی (١٠٠) سەد شوێنی ئایینی لە مزگــەوتو خانــەقاو تەکیــەو دێــرو کلیــسە هەیــە، شــوێنە هــەرە بەناوبانگــەکانی موســڵمانی تەکیــەی نــەجیب جــەباریو تەکیــەی تاڵەبانیو خانەقای سەید ئەحمەدو مزگەوتی (خادم السجادە)ن.

خانووه كۆنەكانی كەركووك لەسەر ئەندازیاری كۆنی ڕۆژهەڵاتیی دروستكراون، حەوشەكانیان گەورەن‌و لە دوو نهۆم پێكهاتوون‌و بە بەردو گەچ دروستكراون، بەڵام خانووە تازەكانی بەتایبەتی لە گەڕەكی شاترلوو لەسەر ئەندازیاری تازەی ئەورووپایی دروستكراون، لەباتی حەوشەی كۆن باغچەیان تێدایە. دانیشتووی كەركووك لەنەتەوەكانی كوردو توركمان‌و عەرەب پێكهاتوون لەگەڵ هەندێ كەمایەتی دیكە وەكو ئەرمەنی، زۆربەی دانیشتوانی كەركووك‌و دەوروبەری لەم هۆزە كوردانەن:

شوان، تاڵەبانی، داوودە، ساڵەیی، زەنگەنە، زەند، ڕۆژبەیانی، پالانی، كێچ، لەك، وەندی، بەرزنجی، عەرەبەكانیش لەم تیرانە پێكهاتوون:

عوبێد، جبور، حجێش، ئەلبوو حەمدان، نەعیم، كوڕوی، حەرەب، عەززە، سعێدات، سایح، بەنوو زەید، توركمانەكانیش لە تیرەكانی تاتران‌و بەیات پێكهاتوون. كەركووك شارێكە مەلەوانی لەناو زەریای نەوتدا دەكات، لەبەر ئەوەیە شاری (زێڕی ڕەش)یشی پێدەڵێن. مەڵبەندی بنچینەیی نەوتی كەركووك دەكەوێتە بابا گوڕ گوڕ كە كەوتۆتە باكووری ڕۆژئاوای شاری كەركووك. ڕۆژی (١٤)ی مارتی

١٩٢٥ پەیمانێك لەنێوان عێراقو كۆمپانیایەكی ئینگلیزی لەبابەت بەدەستخستنی نەوتەوە مۆركرا. بەپێی بەندەكانی ئەم پەیمانە، كۆمپانیای ئینگلیزی بۆی هەیە تا ماوەی حەفتاو پێنج ساڵ سوود لە بەرهەمی ناوچەی نەوت وەربگرێت، بە مەرجێك هەموو دامو دەزگاو كەرەستەی كە بۆ ئەم پرۆژەیە خەرجكراوە لەپاش تەواوبوونی ماوەكە بە خۆڕایی ببێتە موڵكی عێراق، بەشی عێراقیش لەهەر تۆنە نەوتێك چوار شلینی زێڕ بێت. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە كە لە مێژووی دەرهێنانی نەوت هەندێ كارەساتیش ڕوویداوە. لەڕۆژی ١٤ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٢٧ بیرێك لە بیرەكانی نەوت تەقیو لە ئەنجامدا چەند كەسێك كوژرانو لافاوی نەوت بە هەموو لایەكدا بڵاوبووەوە. كۆمپانیا وای بەباش زانی نەوتی نەپاڵێوراو بنێرێتە دەرەوە، بۆ ئەمە ساڵی ١٩٣٢ دوو بۆری نەوت لە كەركووكەوە كێشرایە حەدیسە لە قەراغ ڕووباری فورات، وە لەوێوە كرا بە دوو خەت، یەكێكیان بۆ شاری تەرابلوسی شام كە درێژایی (٦١٠) شەش سەدو دە كیلۆمەترە، دوومیان بۆ شاری حەیفا كە درێژاییەكەی (٧٤٨) حەوت سەدو چلو هەشت كیلۆمەترە. ساڵی ١٩٤٨ بۆرییەكی حەیفا بڕدرا، لەباتی ئەوە لە ساڵی ١٩٥٢ بۆرییەكی

تـر کێـشرایە شـاری بانیـاس لـە سـوریا. دیمـەنی شـاری کـەرکووك لەشەودا گەلێك جوانو نایابە، ڕووناکی لە شاپڵێتە گەورەکانی بۆڕی نـەوت دێتـە دەرەوەی، ئـەم ئـاگرە نـەمرو هەمیـشەییە مێـژووی بەسـەرهاتو کارەساتی بـابو باپیرانمـان دەگێڕێتـەوە، شـار وەکـو بـووکێکی ڕازاوەو خـەملێو بـەناو ڕووناکیـدا بـەنازەوە چـاو شـارکێ دەکـات. ئەگـەر سـەر لووتکـەی شـاخو گونـدو شـارەکانی دیکـەی کوردستـان لـە شـەوی نـەورۆزدا بـبن بـە چـراخان، هـەموو شـەوێکی شاری کەرکووك هەر نەورۆزە.

# گوڵە مێخەك

ناوی مێخـەك بـە زاراوە لاتینیەكـەی (داننـەس كاریۆپلیسیا)یـەو (كاریۆپلیسیا) بە تەنیا واتە: سەر بـە خێزانـی (داننـەس)یـش واتـە: مێخـەك، كـە هـەمووی دەبێتـە: سـەر خێزانـی مێخـەك یـان خێزانـی مێخەك.

ئـەم ڕووەكـە شـوێنەواری بنـەڕەتی چیاكانی نورمانـدیو مێـرەو لـەوێوە بـە جیهانـدا بـڵاو بۆتـەوە، گوڵـە مێخـەك لـە باخـچەو باخـچەوانییدا گـرنگترین گوڵـە. گوڵـەكانی جـوانو ڕێـكو پێـكو بـە دیمـەنو بـۆنێكی خـۆشو دڵگـیری هەیـەو دەتوانرێـت بـە دەسـك پێـشكەش بكرێـت، یـا لـە گوڵدانـدا دابنرێـت، وە ماوەیـەكی زۆر بەگەشیو جوانی دەمێنێتـەوە، مێخـەك ڕووەكێكـە ئەگـەر بمانـەوێت لەڕووی ڕووەكێتیەوە بیناسینو لەڕووەكی دیكەی جیا بكەینەوە بەم جۆرەی دەكەین:

١. مێخـەك لەقـەدو بـاڵادا لاوازو باریكـەو بەرگـەی شـكاندنەوەو نوشتاندنەوە ناگرێت.

٢. لەبەھاردا گوڵدەکاتو لەسەرەتای مانگی تشرینی دووەمەوە تا مایس دەمێنێت.

٣. گوڵەکانی تاك تاکەو هەر گوڵێکی پێنج پەڕی ڕەنگینی هەیە. جۆرێکی دیکەشی هەیە گوڵەکانی تاك تاك نییە، پڕو قەتپەڕو پەڕەکانی لە پێنج زیاترنو کەمو زۆر پەڕەکانی بەگوێرەی جۆرەی گوڵەکەیە.

٤. گەڵاکانی ئەستوورو درێژکۆڵەیەو ڕەنگی سەوزێکی مۆم باوە.

## مێخەك لەچ زەوییەکدا دەچێندرێتو چۆن پەییندەکرێت؟

مێخەك لەهەموو جۆرە گلێکدا دەڕوێت، جا گڵەکە چ لیتەیی، ڕەقەنو توند بێت، یا لمو نەرمان بێت، بە مەرجێ پەیینبکرێتو زەوییەکە بەهێزو شێداربێت لێیدەڕوێت. بەڵام تا لمی زۆربێتو پەیینبکرێت مێخەك چاکتر دەڕوێتو گورجتر پەرە دەسێنێتو هەڵدەدات. (ژەندەل)ی ڕووەکناسی بەناوبانگ، لەساڵی (١٩٣٨)دا تاقیکردنەوەیەکی لەبارەی هۆی شەقبردنی کاسەی گوڵە مێخەکەوە سازاند، دەرکەوت ئەم شەقبردنە سەبارەت بەوەیە کە زۆر پەییندەکرێتو فۆسفۆر زۆر هەڵدەمژێت. هەر لەم ڕووەوە (کە نەرس

بلیهـــــارت)ی ڕووەکناســــــی نــــاوداریش لەســـــالّی (١٩٣٢)دا تاقیکردنەوەیەکی دیکەی لەم بارەیـەوە سـازکردو سـاغیکردەوە کـە هۆی ئەم شەقبردنە زیـاد هەڵمـژینی نایترۆژینـە. هـەروەها ئەوەشـی سـاغکردەوە کـە ئەوەنـدەی کەوچـکێکی چـا لـە پـەینی خـوێنی وشکەوەکراو بەشی ئینجانەیەك گوڵە مێخەك دەکاتو گوڵی درشـتو گەورەی پێدەگرێت. بەڵام چاکترین پـەیین، پـەینی تەویلـەو پـەیینی کیمیاییەو بەتایبەتی پەیینی نیترۆفوسکا کـە هەرسـێ سروشـتەکانی نایترۆژینو فۆسفۆرو پۆتاسیۆمی تێدایەو زۆر بەکارە.

هـەر ئینجانەیـەك گوڵـە مێخـەك (١٥– ٢٠) گـم پـەیینی دەوێـت، باشـترین کـاتی پەیینکردنیـشی پـایزێکی درەنگـە، لەکاتێکـدا کـە ڕووەکەکە گۆپکەو خونچە دەکات.

## مێخەك چۆن ئـاو دەدرێت؟

نابێ بهێڵین ڕووەکەکـە نـە تینـووی بێـتو نـە زۆریـش پاراوبێـت، نـەبادا زیـانی پێبگـاتو لـە هەڵـدان بڕەوێتـەوە، چـونکە ئـاوی زۆر باشـییەکانی خاکەکـەی پـڕ دەکاتـەوەو کـونو کـەلێنیو درزەکـانی دەگرێتو ئەو هەوایەی تێیدایـە دەریـدێنێتو کـە هەواکەیـشی تێـدا

ئەما ئەوە رەگو ریشەی رووەکە لەبەر بێ ئۆکسژینی بۆ خۆیان دەخنکێن و لەکاردەکەون و ئیتر هیچیان بۆ هەڵنامژرێت و رووەکەکە بەرە بەرە لاواز دەبێت و دەمرێت. جا لەبەر ئەمە ئاودان پەیوەندی بەمانەی خوارەوە هەیە:

١. **جۆری خۆڵ:** خۆڵی لماویی ئاوی لەخۆڵی قەسپە گڵ زۆرتر کورتن و دەبێت زوو زوو ئاوبدرێت، چونکە ڕووەک لەم وەرزەدا هەر ئاوێکی وەریدەگرێت زوو بەهەڵمی دەیداتەوە.

٢. **جۆری هەڵدان:** کاتێ رووەك گوڵدەکات نابێت ئاوبدرێت، نەوەك گوڵەکانی هەڵوەرن، جا بۆ ئەوەی بزانین ڕووەکەکە تینوویەتی یان نا، پێویستە بە پەنجە یان بە چیلکەیەك کەمێ لە خۆڵەکەی دەوروبەری ڕووەکەکە بە ئەندازەی (١– ١,٥) گرێ هەڵکۆڵین، ئەگەر هاتوو لماوی و شێداربوو ئەوە رووەکەکە ئاودانی ناوێت، نەخێر ئەگەر هاتوو وشك بوو ئەوە ئاودانی دەوێت و تینوویەتی.

## گوڵە مێخەك چۆن زۆر دەكرێت:

گوڵە مێخەك بەدوو جۆر زۆر دەكرێت:

١. **بە تۆكردن:** چاكترین كاتی تۆكردنیش مانگی مارتە؟

٢. **بە قەڵەم چاندن:** باشترین كاتیش بۆ ئەم جۆرە چاندن مانگی شوباتە.

جۆرە چاندنی یەكەم زۆر باو نییە، مەگەر بیانەوێت جۆرە گوڵێكی تازە بابەتی لێبێنینەوە گۆڕێ، یا ئەگەر هاتوو بە تۆوكردن بەرهەمی باشتری وەكو جۆی ماگریتی دەدا، چونكە بە تۆوكردن بەرهەمی زۆرتردەداتو گوڵی گەورەو چاك دەگرێت. جا بۆ ئەمەیش دەبێ تۆوەكە زۆر سفت بچێندرێتو ئەو زەوییەی بۆی ئامادە دەكرێت، وا چاكە جۆرە گڵەكەی تێكەڵ بە لمو خۆڵو پەیین بكرێتو دوایی چاندنی تۆوەكان نابێ لە (٣-٤) ملیمەتر زیاتربێت. هەروەها دەبێت باش ئاو پرژێن بكرێتو وازی لێنەهێندرێت تا تۆوەكان دەڕوێن، هەر كە (٤-٦) گەڵای سەوزی دەركرد، ئەوسا دەبێت، بگوێزرێتەوە ناو ئینجانەو جێگای دیكە. بەڵام پێویستە ئینجانەكەی یا ئەو شوێنەی بۆی دەگوێزرێتەوە هەتاو بیگرێتو كپ بێو بەرەو باو نسرمو سێبەر نەبێت. لەگەڵ ئەمەشدا، بەپێی ئەو ئەزموونەی كە

(هوللی) زانای بەناوبانگ کردوویە، هەندێ جۆری هەیە ئەگەر لەبەر سێبەریش بڕوێنرێت لە کلۆرۆفیل دروستکرندا بەهێزتر دەبێت. مێخەك سەبارەت بەوەی کە لاسکەکەی لاوازەو ڕاست ڕاناوەستێتو دەچەمێتەوە، دەبێ چەپەری بۆ هەڵببەسترێتو بۆ ئەوەی لە چەمینەوەو شکانەوە بپارێزرێت کەڵك لەم ڕێبازانەی خوارەوە وەردەگرێت:

هەر بڕکێك (٣-٤) تلێشی قامیش یا تەرکە، یا چڵی (٥٠) سانتیمەتری بەدەورو پشتدا دەچەقێندرێتو بەدواوە دەزوو لێکدەتەندرێتو بڕکەکان لە شکانەوەو چەمینەوە دەپارێزن.

٢. یا سێ چڵی (٥٠) سانتیمەتری بەدەور بڕکێکدا دادەکوترێنو لەجیاتی دەزوو بازنە تێلیان پێدادەکرێت بە مەرجێ یەکێکیان لەناو قەد چڵەکان بەرەو خوارترو دووەمیان لەناویان بەرەو خوارترو دوومیان لەناوقەد بەرەو ژوورتر بێتو بڕکەکە بکەوێتە نێو ئەم پەرژینەوەو (٣-٤) گەڵای سەرووی نەبێت ئیتر نابێ هیچی پێوە بمێنێت. کاتێ کە قەڵەمەکانیش دەبڕدرێن دەبێ لەژێر گرێکانەوە ببڕدرێتو پۆپەکانیان بقرتێندرێن ئەگینا هەڵم باش دەرنادەن ئەمجا

دوای ئـــەوەی قەڵەمـــەکان دەبـــڕین بـــەم جـــۆرە شـــێوانەی خـــوارێ دەیانچێنین:

١. پێویستە گڵەکەی لمی زۆربێت.

٢. دەبێ گڵەکەی بە ئەندازەی (٢)سم بۆ قووڵبکرێت.

٣. پێویـسته قەڵەمـەکان هـەر یەکـە (٣)سـم لەیەکـەوە دووریـن‌و بـەڕیز بڕوێندرێت.

٤. دەبێ ڕیزکانیش هەر یەکە (٣) سم لەیەکەوە دووربن.

٥. دوای روانـدنی قەڵەمـــەکان پێویـستە ئاوبـدرێت‌و نەهێڵـدرێت‌و بەهیچ جۆرێك تینوویـان بێـت‌و ئـیتر بـەم جـۆرە پـاش (٦– ٧) هەفتـــە قەڵەمـــەکان گەشـــە دەکـــەن‌و دەســـت بـــە ڕەگ داکوتاندەکـەن‌و ئەمـەیش بـەوەدا دەرکـەوێت کـە لەسـەرەوە گۆپکــە دەکــەن. ئـــەمجا لەپاشـــان بـــۆ جێگـــای پێویـــست دەگوێزێتەوەو هەر یەکە (٣٠–٤٠) سم لێك دوور دەڕوێندرێت.

# پێرست

